حکومەتی هەرێمی کوردستان — عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پڕۆگرام و چاپەمەنییەکان

# سەرەتاکانی کۆمەڵناسی

## بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەیی وێژەیی

**دانانی**

د. قيس نـــوري — د. حسام الدين الالوسی
د. يونس حمـادی — د. احسـان محمد الحسن
صبيح جبر الكعبي — احـلام رشيد حـلاوي

**وەرگێڕانی**

د. ئیحسان فوئاد — د. حسام الدين الالوسی
رەئوف حەسـەن — فوئـاد تاهیر سـادق

**پێداچوونەوەی زانستی و بژارکردنی**

عوبێد خدر فەتحوڵڵا
عومەر عەلی شەریف

چاپی چواردەهەم ٢٠١٥زایینی ٢٧١٥کوردی ١٤٣٦کۆچی

| ناوەڕۆک | | لاپەرە |
|---|---|---|

## پێشەکی:

کۆمەڵناسی یەکێکە لەو زانستە گرنگانەی کە کۆمەڵانی پەرەسەندوو و پێشکەوتوو پێویستیان پێیەتی، لەبەر کاریگەری ئەم بابەتە لە تێگەیشتنی سرووشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و رەفتاری کۆمەڵایەتی و ئەو دامودەزگایانەی کە مرۆڤ ئەندامە تیایاندا و تێکەڵاویان دەبێ، بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی کۆمەڵایەتی و شیکردنەوەیان بەو شێوەیەی کە هۆ و ئەنجام و ئاکارەکانی چارەسەرکردنەکەی دەستنیشان بکات تا مرۆڤ و کۆمەڵ لە گرفتەکانی رزگار بکات.

کۆمەڵناسی پەیوەندییەکی بەهێزی بە زانیارییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەوە هەیە وەك ئابووری و مێژوویی و جوگرافیا و زمان و وێژە و پەروەردە و دەروونناسی، بۆیەش گرنگە قوتابی لە قۆناغی ئامادەییدا لە هەموو بەشەکانی ئەم بابەتە بگات.

خوێندنی بابەتی (کۆمەڵناسی) لە سێ بواردا بۆ خوێندکار بە کەڵکە:

یەکەمیان: تا لە سرووشتی راستەقینەی کۆمەڵ و جموجۆڵ و دابونەریت و کێشەکانی کۆمەڵ ئاگادار بێ.

دووەمیان: گرینگدان بە هەندێ بابەتی کۆمەڵناسی کە لەوانەیە ئەم زانیارییە لە زانکۆدا بە کەڵکی قوتابی بێت، گەر هاتوو لەم بابەتەوە تایبەتمەند بوو.

سێیەم: تێگەیشتنی لایەنی بیرو هزری ژیانی کۆمەڵایەتی و زانیاریش وا لە قوتابی دەکات کە لە نێو کۆمەڵگەدا رابێت و بتوانێ بە هێمنی خۆی بگونجێنێ.

ئەم کتێبە شەش بەند دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە، یەکەمیان کۆمەڵناسی دەناسێنێ و بوون و سەربەخۆیەکەی لە زانیارییەکانی دیکە جیا دەکاتەوە، بەندی دووەمیش

باسی پرۆگرام و بوارەکانی کۆمەڵناسی دەکات و پەیوەندی کۆمەڵناسی بە زانیارییەکانی تری وەك دەروونناسی و مێژوو و ئابووری و ئەنترۆپۆلۆژیا و یاسا دەکۆڵێتەوە.

کەچی بەندی سێیەم تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و چۆنیەتی پێکهاتنیان و ئەرکە سەرەکییەکانی کە بەردەوامی و مانەوە و بە کۆمەڵ دەبەخشێ و بەرەو پێشەوەی دەبات. لە بەندی چوارەم بایەخ بە شیکردنەوەی کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەدات، کە دووچاری مرۆڤ و کۆمەڵی هاوچەرخ بوونە، ئەم شیکارکردنەش ئاماژە بۆ چەمکی کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەکات و لە هۆکارە بابەتی و خۆیەکان و خەسڵەتەکانی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی دەکۆڵێتەوە.

بەندی پێنجەم لێکۆڵینەوە لە بارەی دابینکاریی کۆمەڵایەتی و رۆڵی لە پابەندکردنی تاکەکەس و دوورخستنەوەی لە لادان و تاوانکاری دەکات، هەروەها بابەتەکە باس لە گرنگی شێوازەکانی ناوەوە و دەرەکی دابینکاریی کۆمەڵایەتی دەکات لە گەشەپێدانی کەسایەتی مرۆڤ و گرنگترین رێبازەکانی دەستنیشان دەکات، هەروەها کارو دەوریان دیاری دەکات.

بەشی شەشەم و کۆتایی تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵایەتی لە بارەی چەمك و جۆر و هۆیەکانی و ئەنجامەکانی بەسەر تاك و کۆمەڵدا تایبەتمەند دەبێت.

ئاواتەخوازین بابەتەکانی ئەم کتێبە بە سوود و کەڵك بێ بۆ قوتابیانی پۆلی دەیەمی وێژەیی و لەگەڵ هزر وبیر و تواناکانیان بگونجێ.

# كۆمەڵناسی: چەمك و پەیدابوونی و ئامانجەكانی

## أ- چەمك و پەیدابوونی كۆمەڵناسی:

**چەمكی كۆمەڵناسی:** ئەو زانستەیە كە لێكۆڵینەوە لە بارەی كۆمەڵگە و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی ناو كۆمەڵگە مرۆڤییەكان دەكات و هەوڵی پشكنین و شیكردنەوەی بارودۆخ و كێشە گرنگەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی دەدات.

ئەم زانستە بایەخێكی گەورەی لەلای كۆمەڵگە پێشكەوتووەكان هەیە، چونكە لە سرووشتی پەیوەندیی كۆمەڵایەتی و دەزگای كۆمەڵایەتی و دیاردە كۆمەڵایەتییەكان دەكۆڵێتەوە و هەروەها جیاوازی و ململانێی چینایەتی لێكدەداتەوە و ، باس لە نایەكسانی كۆمەڵایەتی و جۆرەكانی لادانی كۆمەڵایەتی و گۆڕانە كۆمەڵایەتییەكان دەكات.

زاراوەی كۆمەڵناسی ( Sociology) بۆ یەكەمجار لەلایەن ئۆگست كۆنت بەكارهاتووە و چەندین پێناسەی جۆراوجۆر بۆ ئەم زاراوە كراوە، ئۆگست كۆنت بە زانستی شیكردنەوەی دیاردەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی دادەنێت..

ئەو بابەتە كۆمەڵایەتییانەی لە چەرخە كۆنەكانەوە پەیدابوون تێكەڵ بە فەلسەفە و وێژە و مێژوو و رامیاری و ئایین كرا بوون و ماددە و بابەتەكانیشی لەم لاو ئەولا بڵاوببوونەوە و بەرنامەكەشی ناڕوونی و ناتایبەتمەندی پێوە دیار بوو. چوارچێوە بیردۆزەیی و جێبەجێكاریەكانیشی بێ توانا و نادیار بوون، ئەمە وێڕای ئەوەی كە ئەو لێكۆڵینەوە و باسە كۆمەڵایەتییانەی كە لە كاتێكی زوو دەركەوتن، كۆمەڵناسی پسپۆڕ نەیان نووسیبوون، بەڵكو چەند كەسانێكی ئەدیب و فەیلەسووف و مێژوونووس و كەسانی ئایینی نووسیبوویان، بەڵام ئەو بابەتە كۆمەڵایەتییانەش كە ئەو نووسەرانە دەیاننووسین بریتیی بوون لە فرمانەكانی كۆمەڵگەی مرۆڤ و سرووشتەكەی و گیروگرفتی سەردەم و چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوەی چینەكانی

کۆمەڵگە و ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر بوونی ئەو چینانە و دەوری رامیاری و ئایین لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتییدا... تاد.

جا لەبەر ئەوەی نووسەر و بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان لە بواری کۆمەڵ و بەکارهێنانی بیردۆزە و هونەری لێکۆڵینەوە و باسەکانیدا پسپۆر نەبوون، ئەمەش لەبەر ناتەواوی و ناسەربەخۆیی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان لە چواچیوەی زانستێکی دیاریکراو، بۆیە نووسینەکانیان پێنج سیفەتی بنەڕەتییان پێوە دیار بوو کە ئەمانەن:

١- زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان تێکەڵ بە دیاردەکانی کۆمەڵ و کردار و کارلێکەکانی مێژوویی و رامیاری و ئایینی و وێژەیی کرا بوون.

٢- لێك جیانەکردنەوەی ئەو راستییانەی نووسەر دەیاننووسێت، لەگەڵ ئەو حوکمە بەهاییانەی دەریان دەبڕێت کاتێ بابەتەکە یان کێشە کۆمەڵایەتییەکە دەخاتە پێش چاو.

٣- پشت نەبەستنی توێژەر یان نووسەرە کۆمەڵایەتییەکە بەو بیردۆزە کۆمەڵایەتییانەی کە نووسینەکانی دەخاتە چوارچێوەیەکی دیاریکراو کە خزمەت بە شیکردنەوەی بابەتەکە دەکەن و ئامانج و بەرنامەکانی روون دەکەنەوە.

٤- توێژەرەکە یان نووسەرە کۆمەڵایەتییەکە پشت بە بەرنامەیەك یان رێبازێکی باسکردن نابەستێ کە توانای هەبێ زانیاری و راستییەکان کۆبکاتەوە و پۆلێنیان بکات و بنەماکانی بۆ دابرێژێت.

٥- نووسەر و بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کات لە بابەتە کۆمەڵایەتیەکان تایبەتمەند نەبوون، ئەمەش وای کرد نەتوانن سەربارێك بخەنە سەر گەشەی زانستی کۆمەڵایەتی و بەرەو پێشەوەی ببەن.

### - هۆکاری بێهێزی بابەتەکان لەم کاتەدا

ئەو بارودۆخ و کەموکورتییەی کە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان بە خۆیانەوە بینی، نووسین و بابەتە کۆمەڵایەتییەکان لاواز و بێ توانا بوون بەهۆی تایبەتمەندنەبوونی لە سنووردار کردنی نووسین و توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکان، زاڵبوونی کێشەی هەڵچوون و حوکمی بەهایی لەسەریان، نەیانتوانی بەشداری بکەن لە گەشەپێدانی مرۆڤ و بەرەو پێشەوە بردنی ژینگە کۆمەڵایەتییەکان و رەفتار و بەها و دامەزراوە میرکارییەکان. بۆیە پەیدابوونی کۆمەڵناسی وەك زانیارییەکی سەربەخۆ و دارێژراو دواکەوت و بابەتەکانی پچڕ پچڕ و پەرش و بڵاو لە چەند مەیدانێکی لێکۆڵینەوە مانەوە.

## رۆڵی بیرمەندانی عەرەب و موسڵمان لەسەرهەڵدانی کۆمەڵناسی:

زانا عەرەب و موسڵمانەکان بایەخیاندا بە لێکۆڵینەوەی واقیعی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و پەیوەندی بە سرووشتی مرۆڤ و پێبەخشەکانی ژینگە و ئەو هۆکارانەی کاری تێدەکەن و پێکهێنەرەکانی ئاوەدانی مرۆڤایەتییان وەسف کردووە و سرووشتی کار و کاردانەوەی نێوانیان شیکردۆتەوە و ئەو هۆکارانەیان دیاریکردووە کە بە تێپەڕینی کات دەبنە هۆی گۆڕانی کۆمەڵگە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دیکە و ئەو هۆکارانەشیان دەستنیشان کردووە کە دەبنە هۆی کامڵی و جێگیربوونی. هەروەها لە خاسیەتی کۆمەڵگەی نموونەیی و کارتێکردنی سەرکردایەتی لە گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چوون و جێگیربوونی دووان و باسیان لە سیفەتەکانی سەرکردایەتی و رۆڵ و فەرمانەکانی لە یەکگرتنی کۆمەڵ و لێك هەڵوەشانەوەی کردەوە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە، ئەوەیە کە دەبێ بڵێین لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی لای عەرەب و موسڵمانان لە دوو رەوڕەوەتی سەرەکیدا سەرهەڵدەدەن، ئەوانیش رەوڕەوەتی فەلسەفییانەی ئایینیانەن کە (فارابی و ئیخوان ئەلسەفا و غەزالی و ئیبن روشد) نوێنەرین و، رەوڕەوەتی کۆمەڵایەتی و ئەنترۆپۆلۆژین کە (ئیبن خەلدون و ماوردی و ئیبن بەتووتە و حاحیز) نوێنەرین.



## • فارابی (۸۷۰- ۹۵۰) زایینی:

کۆمەڵناسێکی موسڵمانە و لێکۆڵینـەوەی لە بارەی کۆمەڵگە کردووە و لە راسـتیی کۆمەڵگــەی مرۆڤایــەتی کۆڵیوەتــەوە، رەمـــەکی (غریـــزة) کۆمەڵایـــەتیی و کۆبوونـــەوەی مرۆڤـــی بەیەکـــەوە بەســتۆتەوە، ئـــەو بنـــەما ئـــایینی و فەلـــسەفییانەی دانـــا کـــە کۆمەڵگـــەی نموونەیی پشتیان پێ دەبەستێ، فـارابی کۆمەڵگەی کرد بە دوو پۆل کە ئەوانیش:

۱- **کۆمەڵگەی تەواو:** ئەو کۆمەڵگەیە کە بەختیاری بۆ ئەندامەکانیان وەدی دێنێ.

۲- **کۆمەڵگە ناتەواوەکان:** ئـەو کۆمەڵگەیانـەن کـە نـاتوانن لەبـەر هەنـدێ هۆکـاری پەیوەست بە سرووشتەکەی و بنیاد و سەرۆکایەتی ئەو بەختیارییە بهێننەدی.

سەرەڕای ئەوەی کە فاڕابی لە بابەتی فەرمانی سەرکردە و سیفەتەکانی، رۆڵـی سەرکردە لە دابینکردنی بەختیاری و خۆشـگوزەرانی بـۆ ئـەو کۆمەڵگەیـەی کـە حوکمی دەکـات کۆڵییـەوە، بایەخیـشی بـە بابـەتی هەڵبـژاردنی سـەرکردە دا و هەڵبژاردنەکەش بەلای ئـەوەوە، سـیفەتێك هەیـە کـە پێویـستە لـە سـەرکردەدا هـــەبێت، یـــان ئـــەو کۆمەڵگەیـــەی ســـەرکردەیی دەکـــات و ئـــەو مەترســـی و گیروگرفتانەی تووشیان دەبێت دیاری بکرێت.

## * غەزالی ( ١٠٥٨ – ١١١١ ) زایینی :

ئەبو حامید غەزالی توانی بە بیروڕا کۆمەڵایەتییەکانی خۆی توێژینەوەکانی لە بارەی مرۆڤ و کۆمەڵگە لە هەموو بوارەکاندا دەوڵەمەند و گەشەی پێبدات، لە لێکۆڵینەوەکانیدا داهێنانی لە بواری پرۆگرامی زانستی بنچینەیی بەکارهێنانەوە بۆ کۆکردنەوەی راستی و زانیاری و پۆلینی کردوون، ئەم راستیانەش بۆ شیکردنەوەی دیاردەکانی مرۆڤایەتی و رووداوەکانی کۆمەڵایەتی و کێشەکانی شارستانیەتی نێو کۆمەڵ بەکارهێناوە، بەمەش بەرنامەیەکی زانیاری بنچینەیی بۆ تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی دامەزراندووە و لە هۆکار و راستییەکانی کۆبوونەوەی مرۆڤایەتی و سوودی بۆ کەس و بۆ کۆمەڵ و کۆمەڵگە کۆڵیوەتەوە و رۆشنایی خستۆتە سەر رۆڵی کۆمەڵ و لە کاری بونیادنانی ژیان و پەرەپێدانی و بایەخی بەلایەنی رەوشت و بەها نموونەییەکانی داوە بەوەی کەوا بناغەی کۆمەڵن لە ئێستاکە و دوارۆژدا.

## * ئیبن خەلدوون ( ١٣٣٢ – ١٤٠٦ ) زایینی :



ئیبن خەلدون بە دامەزرێنەری کۆمەڵناسی دادەنرێ، چونکە کۆمەڵزانی هێنایە کایەوە و لێکۆڵینەوە و رێبازی باسکردن و زانیارییانەی بەرەو پێشەوە برد و واقیعی

**لە کتێبەکەی (عالم العمران)**

کۆمەڵی مرۆڤ و بنەمای نیشتەجێبوونی شیکردەوە، ئەمە سەرەڕای لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە دیاردەکانی ئارامی و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و دانانی یاساکانی بزووتنەوەی کۆمەڵ لەگەڵ لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان واقیعی کۆمەڵایەتی و شارستانی و ئەو بیرو

باوەڕانەی کە لە کۆمەڵگەدا دەردەکەون **لە کتێبە بەناوبانگەکەی (پێشەکی - المقدمة).** ئەمە جگە لەوەی کە ئیبن خەلدوون لەبەر هۆکاری تیرەگەری و هۆزایەتی کە ئەندامەکانی یەك تیرە بە یەکتر دەبەستێتەوە و کۆمەڵگەی مرۆڤی کردووە بە چەند چینێکی دیاریکراو وەك کۆچەر (بدو) و گوندنشین و شارستان.

## - کۆمەڵناسی چۆن سەری هەڵدا:

ئەو بیروباوەڕ و هزر و بیردۆزە کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵناسە عەرەبەکان لەژێر سایەی ئیسلامدا خستیانە بەرچاو، بە بەردی بناغەی پەیدابوونی کۆمەڵناسی لای عەرەب و موسڵمانەکان دادەنرێت. ئەو زانستە لە رێگەی رێنماییەکانی پێشەنگی هزری و بیر و بۆچوونەکانیان و بیردۆزەکانیان هەیانبوو، بنچینە و تایبەتمەندی خۆی هەبوو کە گەلێك بیرکارە کۆمەڵایەتییە ئەوروپاییەکانی پشتیان پێ بەستووە وەك (هۆبز و لۆك و رۆسۆ و هێگڵ و کۆنت و دۆرکهایم) کەچی لە ئەوروپادا باس و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا و دیار بەرەو پێشەوە چوون، بە تایبەتی دوای چەرخی راپەرینی ئەوروپا کە بزووتنەوەی بووژاندنەوەی زانیارییە کۆنەکان و دۆزینەوە جوگرافیاییەکانی بینی و بیری خەڵك لە کۆت و فشاری ئایینی (لاهووتی) رزگار بوو کە کڵێسە بەسەریدا سەپاندبوون. کۆمەڵە بیرمەند و زانایەك خەریکی باس و لێکۆڵینەوەی زانیاری بوون، ئەو بیرمەندانە نوێنەرایەتی چەندان قوتابخانەی بیری و فەلسەفییانەیان دەکرد کە گیرۆدەی بێ ئەنجامی و دواکەوتوویی سەدەکانی ناوەڕاست بوون، بەڵام ئەو قوتابخانانە لەبەر ئەو بارودۆخە تازە پەیدابووەی کۆمەڵگەی ئەوسا، خۆی گوێزایەوە بۆ پێشکەوتنی چەرخی تازە و کاریگەری نوێ گرینگترین ئەو قوتابخانانەش: قوتابخانەی دەروونی و قوتابخانەی پەیمانی کۆمەڵایەتی و قوتابخانەی بایۆلۆژی و قوتابخانەی مێژوویی و قوتابخانەی (ماددی) بوون.

## هۆیەکانی سەرهەڵدانی کۆمەڵناسی وەك زانستێکی سەربەخۆ :

١- ئەو کارەساتە کۆمەڵایەتییە خراپانەی لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی کە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئەوروپا پەیدابوو بووە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵناسی وەکو زانستێکی سەربەخۆ.

٢- پشێووی رامیاری دوای شۆڕشی فەرەنسی و شەڕەکانی ناپلیۆن کە هەموو ئەوروپای گرتەوە.

٣- زاڵبوونی بیروباوەڕی دەستخستنی دەوڵەت لە رێکخستنی کۆمەڵگە و پاراستنی لە چەوساندنەوە و قۆرخکاری کێبڕکێ و چاودێری بۆرسە (بازاڕی گۆڕینەوەی دراو).

ئەو خاڵانەی سەرەوە دەورێکی کاریگەرییان لە پەیدابوونی کۆمەڵناسی و سەربەخۆییەکەیدا هەبوو، تا ئەویش لەگەڵ زانیارییەکانی دیکەدا دەوری خۆی هەبێ لە رەنگرێژی کۆمەڵگە و گەشەپێدانی و نەهێشتنی گیروگرفتەکانی مرۆڤ و ئەو خراپەکارییانەی گیرۆدەیان بووبوون لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتییە خێراییانەی لە سەدەی نۆزدەیەمی زایینیدا بەسەر کۆمەڵگە ئەوروپاییەکاندا هات. ئەو رووداو و گۆڕانکارییە خێرایانەی کە لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم کیشوەری ئەوروپا بەخۆیەوە بینی هانی گەشەپێدان و بەرەو پێشەوە بردنی باس و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەکانییدا لە لای بیرمەندە ئەوروپاییەکان بە هەردوو جۆرییەوە ، تیۆری و جێبەجێکردن و گەشەپێدان، ئەو باس و لێکۆڵینەوانەش هاندەرێکی (ورياکەرەوەیەکی) راستەوخۆ بوو بۆ پەیدابوونی کۆمەڵناسی بە شێوەی زانیارییەکی سەربەخۆ لە فەلسەفە و مێژوو و ئایین و وێژە و زانیارییەکانی تر، دوای سەربەخۆیی کۆمەڵناسی ئەم زانیارییە توانی گەشە بکات و پەل بهاوێ و بە تواناتر بێت بۆ لێکدانەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و شیکردنەوەی رەگەزە بنەڕەتییەکانی

چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتە مرۆڤایەتیانەی تاکەکەس و کۆمەڵ لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا تووشیان ببوون.

گرنگترین ئەو کۆمەڵناسە ئەوروپاییانەی کە بەشدارییان لە سەربەخۆیی و گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چوونی کۆمەڵناسی کرد ئەمانە بوون:

- **ئۆگست کۆنت ( ١٧٩٨- ١٨٥٧ ) زایینی:**

کۆمەڵناسێکی فەرەنسییە و لە ریزی پێشەوەی بیرمەندانی کۆمەڵناسی ئەوروپا دادەنرێت و تایبەتمەند بووە بە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکەس و کۆمەڵگە. ئۆگست کۆنت لە کەسە یەکەمانەیە کە هەستی بە پێویستبوونی هاتنەکایەی زانستێکی تایبەت بە کاروباری کۆمەڵایەتییەکان کرد و ئەم زانایە سەرتا ناوی (فیزیایی کۆمەڵایەتی) بۆ ئەم زانستە هەڵبژارد. بەڵام دواتر ناوی سۆسیۆلۆگی بۆدانا.



کۆنت بڕوای وابوو کە بابەتی سەرەکی کۆمەڵناسی .. سیستەم و رێکخستنی کۆمەڵایەتییە، واتە لە بەشە لێك بەستراوەکانی توندی رژێمی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە بەو بەڵگەیەی کە هەر گۆڕانێك لە بەشەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی کاردەکاتە سەر بەشەکانی تر لە قۆناغێك بۆ قۆناغێکی دیکەوە دەیانگۆڕێت ئەم زانستە لە کاروکاردانەوەی تایبەتی بەشە جیاجیاکانی رێکخستنی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە، بۆیەش کۆمەڵناسی بە کارێکی رێکخستنی گشتی کۆمەڵایەتی دادەنرێت.

بەم پێیە و بە بۆچوونی کۆنت کۆمەڵناسی لە دوو بابەتی سەرەکی دەکۆڵێتەوە:

### ١- ستاتیکی کۆمەڵایەتی (جێگیری): Social Static

بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگە مرۆڤایەتی لە حاڵەتی جێگیر و سەقامگیریدا، هەروەها لە بارەی سیستەمی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی نێوان سیستەمەکە، لەگەڵ دەستنیشانکردنی شێوەکانی تەبایی بنەمای گشتی، گرنگترین بابەتەکانی زمان و ئاین و خێزانە، هەروەها لە رۆڵی هەر بەشێك لە بەشەکانی رێکخستن دەکۆڵێتەوە تا بەردەوامی بەکاری بونیادنانی گشتی و کۆمەڵ ببەخشێ و ئەنجام دەبێتە مایەی ئاسودەیی و جێگیریەتی.

### ٢- دینامیکی کۆمەڵایەتی (گۆڕاو): Social Dynamic

بریتییە لە کرداری گۆڕانی بەشەکانی سیستەم و پێکهاتەی کۆمەڵگە و لە ئەنجامی کارتێکردنی هۆکارێکی دەرەکی یان ناوەکی دەکۆڵێتەوە، کۆمەڵگە لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە بە درێژایی قۆناغەکانی مێژووی شارستانییەت دەگۆڕێت، کۆمەڵگە لە قۆناغی لاهوتی دەگۆڕێت و بە قۆناغی میتافیزیقیا تێدەپەڕێت تا دەگاتە دوا قۆناغ کە (وەزعیە - **الوضعية**) قۆناغی سەرهەڵدانی زانیارییە.

- **هربرت سبنسر (١٨٢٠ – ١٩٠٣) زاییني:**



یەکێکە لە بیرمەندانی کۆمەڵناسی ئینگلیز لــە ڕێیــی بڵاوکردنــەوەی کتێبێکــی ســێ بــەرگی بــە نــاوی کۆمەڵناســی خزمــەتێکی بەرچــاوی بەبڵاوبوونــەوەی کۆمەڵناســی کردووە، هربرت سبنسر دەڵێت: ( گرنگە کۆمەڵناسی ببێ بە زانستێکی سەربەخۆ و دوور لە زانستی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی).

**هــــەوڵی سبنــــسر بــــۆ پەرەســــەندنی کۆمەڵناسی لە دوو خاڵی سەرەکیدا پوختە دەکرێت:**

## ١- بیردۆزی ئەندامیەتی:

ئــەم بیردۆزەیــە لێکۆڵینــەوە لــە بــارەی کۆمەڵگــە دەکــات لەگــەڵ ســەرجەم بوونەوەری گیانلەبەرە زیندووەکان بەراوردی دەکات و ئــەم بیردۆزەیــە جــەخت لەو فەرمانی کۆمەڵایەتییە دەکاتەوە کە بەشەکانی بوونەوەری کۆمەڵایەتی پێی هەڵدەستن، ئەو بەشانەش بەیەکــەوە بەســتراون کــە پێــی دەگــوترێ بەیەکــەوە ژیانی کۆمەڵایەتی سەربەستی سیاسی و ئابووری لەگەڵ ســەرهەڵدانی داهێنــانی زانیاری کردووە.

## ٢- بیردۆزی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی:

ئـەم بـیردۆزە رۆشـنایی دەخاتـە سـەر بابـەتی پەرەسـەندن و نەشـونمای کۆمەڵایەتی، ئەم بابەتـەش لـە زانسـتی زیندەوەرزانییـەوە وەرگـیراوە. پێشتر داروین لـە کتێبەکەیـدا لـەژێر ناونیـشانی (رەچـەڵەکی چەشـنان)ە باسـی گەشەسـەندنی فیزیۆلۆژیـای بوونـەوەران – لەوانـەش مرۆڤـ – بـە درێـژای سـەدەکان لـە شـێوە سـاکارەکانەوە تـا شـێوە ئاڵۆزەکـەی و لـە شـێوە دواکەوتووەکـەی بـۆ بـارە پێـشکەوتووەکەی دەکـات ئـەم گۆڕانکارییـەش ئادەمیزادیش دەگرێتەوە، بەڵام بە نەشونمای کۆمەڵایـەتی ژیـانی لەسـەر زەوی پێـشدەکەوێ لـە رێگـەی کردارێـك پێـی دەگـوترێ گەشەسـەندن یـاخود پەرەسەندن.

سبنسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بۆ سێ چین دابەش کـردووە، کۆمـەڵی سـاکار و کۆمەڵی ئاوێتە و کۆمەڵی ئاڵۆز.

- **ئەمیل دۆرکهایم (١٨٥٨-١٩١٧) زایینی:**



کۆمەڵناسێکی فەرەنسایيە دوای ئۆگست کۆنـت دووەم کەسـە کـە گۆڕانکـاری لـە بنـەماکانی کۆمەڵناسـییدا دروسـت کـردووە. بـە دانـەری کۆمەڵناسی نوێ لە بـوار و بنـچینەی بەرنامـەی زانیـاری دادەنرێـت، بەرهەمـە گرنگـەکانی دۆرکهـایم بـریتیین لـە (رێـسای پرۆگـرام لـە کۆمەڵناسـی) و (دابەشـکردنی کۆمەڵایـەتی کـار) و (خۆکوشـتن) و (فەلـسەفە و کۆمەڵناسی) و (شێوە سەرەتاییەکانی ژیانی ئایینی).

دۆرکهایم پێیوایە کۆمەڵناسی زانستێکی سەربەخۆیە و دیاردەکانی کۆمەڵایـەتی دیاردەی سەربەخۆن.

بەڵام لە بارەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان کە دۆرکهایم تایبەتمەند بووە بەمجۆرە لێکی داوەتەوە:

١- دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دیاردەی **مرۆیین** و لەگەڵ پەیدابوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا سەریان هەڵداوە، بۆیە جیاوازە لەگەڵ دیاردە سروشتیەکان.

٢- شێواز و چوارچێوەی کارکردن و بیروباوەڕی **مرۆیین**.

٣- دیاردەی (شتەکانن) واتە باسی شتە سەربەخۆکان دەکات، کە دەتوانین هەستی پێ بکەین.

٤- خاسیەتی دەرەکی هەیە بە واتا دەکەوێتە دەرەوەی هەستی کەسەکان و لە رابردوودا هەبووە لە ئەمڕۆ و دوارۆژیشیدا هەر دەبێت.

٥- دیاردەکان دروستکراوی تاکەکان نین، بەڵکو دروستکراوی کۆمەڵگەن، بە شێوەیەکی یەك بەدوای یەك لە ئەنجامی تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی سەریان هەڵداوە.

٦- دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دیاردەی داسەپاوون واتە بە زۆری بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵ سەپێنراون بۆیەش دەسەڵاتی خۆی بەهێزی کۆمەڵ بەسەر کەساندا دادەسەپێنێ.

## دۆرکهایم کۆمەڵگە بەسەر دوو جۆر دابەش دەکات:

### یەکەم: کۆمەڵگەی (جوڵێنەر) میکانیکی:

بریتییە لە کۆمەڵێکی ساکار پشت بە سیستەمی کار دابەشکردنی تایبەت نابەستێ، پسپۆڕی هەمەجۆری تێدا نییە، هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵگە لە رووی پیشەوە لەیەك دەچن.

### دووەم: کۆمەڵگەی ئەندامیەتی:

بریتیە لە کۆمەڵێکی ئاڵۆز بە وردی پشت بە سیستەمی دابەشکردنی کار دەبەستێت، دۆرکهایم لەو باوەڕەدا بوو کە کۆمەڵی مرۆڤایەتی لە کۆمەڵێکی میکانیکییەوە پاش زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی سەررووی زەمین بوو بۆ کۆمەڵی ئەندامیەتی دەگۆڕێت.

## ب - پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان:

زانستی کۆمەڵناسی لە سرووشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و هۆ و ئەنجامەکانی دەکۆڵێتەوە ، لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی بۆ بابەتی پەیوەندیەکان لەسەر ئاستی جیاجیان وەکو پەیوەندی نێوان کەسان و کۆمەڵانی بچووك و گەورە دەگرێتەوە، کۆمەڵناسان ئەم پەیوەندییانە وا پێناسە دەکەن کە بریتین لە:

**(پەیوەندی کردن و کارتێکردن و کار و کاردانەوەی نێوان کەسان و کۆمەڵان بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییەکانی تاکە کەسان و وەدی هێنانی ئاواتەکانیان و پێکهێنانی ژیانێکی کۆمەڵایەتی پاشەکەوتکراو بە ڕووداو و دەستکەوتەکان).**

وەکو پەیوەندی نێوان کڕیار و فرۆشیار و پەیوەندی لە نێوان قوتابی و مامۆستا و پەیوەندی نێوان پزیشك و نەخۆش و نێوان کرێکار و ئەندازیار و نێوان کوڕ و باوك و نێوان دادوەر و تاوانبار و ئەمانە چەند جۆرێکی جیاجیای پەیوەندی کۆمەڵایەتین.

لە رووی فەرمانەوە چەند جۆرە پەیوەندییەك دەگرێتەوە وەك:

١- پەیوەندی هاوکاری و کێبڕکێکردن.

٢- پەیوەندی کاتی و پەیوەندی هەمیشەیی.

٣- پەیوەندی ئاسۆیی و ستوونی.

٤- پەیوەندی رەسمی و نارەسمی.

- **پەیوەندی هاوکاری:** ئەمجۆرە پەیوەندییە کە کەسان و کۆمەڵان بەشداری لە وەدیهێنانی ئاواتەکانی دوور و نزیک دەکەن لە ڕێگای تێگەیشتن و کاری هاوکاری و هاوبەشدا، بەو پێیەوە کەسان و کۆمەڵان بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانیان پێکەوە هاریکاری دەکەن وەک هاوکاری نێوان قوتابی و مامۆستا بۆ دابینکردنی ئاستێکی زانیاری بەرز لە قوتابخانە و بواری پەروەردە و فێرکردندا.
- **پەیوەندی کێبڕکێش:** ئەم جۆرە پەیوەندییە کە لەسەر بنەمای خۆ سەلماندنی هەر تاکێك یان کۆمەڵێك دامەزراوە لە ڕێگەی پێشبڕکێی و کێبڕکێوە کە لە نێوان خۆیان ئەنجامی دەدەن و سوود بە کۆمەڵ دەگەیەنن.
- **پەیوەندی هەمیشەیی:** ئەمجۆرە پەیوەندییە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە ڕوودەدات شێوەی هەمیشەیی و بەردەوام بەخۆوە دەبینێ، وەك پەیوەندی نێوان ڕۆڵەکانی یەك خێزان کە تا دوا تەمەنیان درێژەی دەبێت.
- **پەیوەندی کاتی:** پەیوەندییەکی تەمەن کورتە، چەند ساتێکی دیاریکراو دەخایەنێت و بە نەمانی هۆکارەکەی کۆتایی پێدێت وەك پەیوەندیەکەی نێوان کڕیار و فرۆشیار.
- **پەیوەندی ستوونی:** ئەمەیان کار و کاردانەوەی نێوان دوو کەس یان زیاترە کە هەر یەکەیان سەر بە ئاستێکی کۆمەڵایەتییە، وەك بەڕێوەبەر و فەرمانبەرەکەی یان پەیوەندی نێوان ئەندازیار و کرێکار.
- **پەیوەندی ئاسۆیی:** پەیوەندییەکی نێوان دوو کەس یا زیاترە هەموویان لە یەك ئاستی کۆمەڵایەتین وەك پەیوەندی نێوان مامۆستا بە مامۆستایەکی دیکە یان پەیوەندی نێوان قوتابیان... تاد. ئەوەی شایەنی باسە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵەیەك هۆ و ئەنجامیان هەیە.

## هۆكاری پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان:

پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان هۆیەكەی دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵێك هاندەر و پاڵنەری جیاواز كە هانی كەسان دەدات بۆ بەستنی پەیوەندییەكان، هەروەكو:

١- پاڵنەری ئابووریی پاڵ بە كرێكارانەوە دەنێت تا لە كارگە كار بكەن و پەیوەندی لەگەڵ كرێكاران و خاوەن كارەكەیان ببەستن.

٢- پاڵنەری پەروەردەیی وا لە قوتابی و خوێندكار دەكات كە لە قوتابخانەكەی بخوێنی و چەندین پەیوەندی لەگەڵ قوتابیان و مامۆستایان پەیدا بكات.

٣- پاڵنەری سەربازی هانی جەنگاوەران دەدات تا بچنە ناو دەزگا سەربازییەكان و پەیوەندی بە سەربازانی دیكەوە ببەستن.

٤- پاڵنەری تەندروستی وادەكات پەیوەندی نێوان نەخۆش و پزیشكان بە تین دەكات.

كەواتە چەند پاڵنەرێك پاڵ بە كەسانەوە دەنێت تا پەیوەندی كۆمەڵایەتی لەگەڵ یەكتر پەیدابكەن، ئەمجۆرە پەیوەندییانە بە هەموو ئاستەكانییەوە ئاوات و پێداویستییەكانی ئەو كەسانەی كە پێیەوە پابەندن دابین دەكات و بە یاسا و بڕیارەكانییەوە پابەند دەبن.

پێناسەیەکی دیکە بۆ کۆمەڵناسی هەیە دەڵێت:

**((ئەو زانستەیە کە لە رەفتاری کۆمەڵایەتی تێدەگات و شیکاری دەکات))**

مەبەستیش لە رەفتاری کۆمەڵایەتی:

**هەر جموجۆڵێکی بە ئەنقەستی کەسە کاتێ کە لە نێو کەسانی دیکە دەبێت و دەشبێ ژینگە و بارودۆخی هۆی رەفتارەکە هەبن.**

**رەفتار کردن پشت بە سێ بنچینەی سەرەکی دەبەستێ:**

أ – دوو کەس یان زیاتر کار لە یەکتری دەکەن و ئەو رەفتار و رووداوانە دێتە کایەوە کە بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە پێویستە.

ب– بوونی چەند رۆڵێکی یەکسان یان جیاوازی لە نێوان ئەو کەسانەی کە رەفتار ئەنجام دەدەن و پێی هەڵدەستن.

ج – بوونی چەند پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی هاوشان لەگەڵ کردارە رەفتارییەکان.

## جۆرەکانی رەفتارکردن:

رەفتاری تاکە کەس لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆرێت بەپێی سرووشت و گرنگیەتی رۆڵەکانی کۆمەڵایەتی و ئەوانەی کە لەگەڵ رۆڵی کردارەکە کار لە یەك دەکەن دەگۆرێت. رەفتاری منداڵ سەبارەت بە قسە و جووڵانەوەی بەرامبەر بە منداڵێکی دیکەوە جیاوازە لەو رەفتارکردنەی کە لەگەڵ دایك و باوکی دەیکات. هەروەها رەفتاری قوتابییەك لەگەڵ قوتابییەکی دیکە هەمان ئەو رەفتارە نییە کە لەگەڵ مامۆستاکەی پەیرەوی دەکات. کەواتە رەفتاری کۆمەڵایەتی پابەندە بە سرووشتی ئەو رۆڵانەی کە وەك فەرمانبەرێك دەیگێرێت. دەتوانین لە میان رۆڵی کارەکەی تاکە کەسەوە پێشوەخت پێشبینی رەفتارەکەی بکەین. بۆ نموونە پێشوەخت دەتوانین رەفتاری پزیشك و رەفتاری نەخۆش و رەفتاری جەنگاوەر جا سەربازی بێت یان ئەفسەر لەمیان رۆڵیانەوە پێشبینی بکەین.

## هۆیەکانی پاڵنەر بۆ رەفتارکردن:

بە تێگەیشتن و شیکردنەوەی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی هۆکاری پاڵنەر بۆ ڕەفتارکردن و شێوازە سەرەکیەکان تێدەگەین، لەوانەیە رەفتاری کۆمەڵایەتی سۆز یان تورەیی یان خۆڕسك بێت وەك خۆشەویستی دایك بۆ منداڵەکانی و لە باوەش گرتنی، یانیش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دابونەریتی کۆمەڵایەتی و رێورەسمییەکانی ژن هێنان یان بەڕێکردنی تەرمی مردوو ناشتنی یان ئەو رێورەسمیانەی لە بۆنە نیشتمانی و ئایینی پەیرەو دەکرێت.

هەندێ جار هۆیەکانی رەفتار دەگەڕێتەوە بۆ ژیریی و هۆشیاری تێڕوانین و هەستی ژیریەتی وەك رەفتاری ئەو قوتابییەی کە دەیەوێ لە رێگای خوێندن و هەوڵدانەوە سەرکەوتنی لە تاقیکردنەوەکاندا بڕوانامەی زانستی بەدەست بێنێ، بگاتە پلە و پیشەیەکی پایەدار لە نێو کۆمەڵدا.

- **بابەتەکانی کۆمەڵناسی:**

کۆمەڵناسی بەوە پێناسەکراوە کە تایبەتمەندە بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، چونکە کۆمەڵناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگە کە لەو تاکە کەسانەی سەر بە کۆمەڵە مرۆڤایەتییەکان و هەر یەکەشیان لە باری پەیوەندییکردن بە یەك و تێکەڵبوون لەگەڵ یەکتریدا پێکدێت. هەریەك لەو کۆمەڵانەش پەیکەر و فەرمان و ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە کە بە زۆری لەگەڵ سرووشتی کۆمەڵگە گەورەکەدا دەگونجێنن و بە هێڵە گشتییەکەیدا دەڕۆن و فەلسەفە و رێبازەکانی ژیانی دەگرنە خۆیان. ئەو کۆمەڵە کۆمەڵایەتییانەش کە کۆمەڵگەیان لێ پێك دێت کۆمەڵناسەکان ناوی رێکخراویان لێ دەنێن، وەکو خێزان و مزگەوت و کڵێسا و پارتی رامیاری و قوتابخانە و کێڵگە و کارگە و فەرمانگە یان یانەی کۆمەڵایەتی یاخود وەرزشی... تاد. دەگرێتەوە.

**هەروەها کۆمەڵگە لەو نیمچە کۆمەڵانە پێك دێت کە وەك کۆمەڵە جەماوەرێك دادەنرێت بۆ وەدیهێنانی چەند ئامانج و ئاواتێکی دیاریکراو تێدەکۆشێت، وەك ئەو چینە کۆمەڵایەتییانەی لە تاکە کەسی ئەوتۆ پێکدێن کە بە بارودۆخێکی ئابووریی و کۆمەڵایەتی تێدەپەڕن.** وەك ئەو کرێکارانەی دەیانەوێ نەقابە یا ئەنجوومەنی کرێکارانەی تایبەت بە خۆیان پێك بهێنن، بۆ ئەوەی بەرپرسی داکۆکیکردن لە مافە کۆمەڵایەتی و پیشەیی و ئابووری و رۆشنبیرییەکانی بگرێتە ئەستۆو ئەو وەرزشکارانەی کە دەیانەوێ یانەی وەرزشی پێك بهێنن بۆ بەجێهێنانی مەشق و یارییە وەرزشییەکانیان...تاد. بەڵام دەتوانین ئەو کۆمەڵانەی کۆمەڵگەیان لێ پێك دێت بە پێی پێوانەی دیاریکراو پۆل پۆلیان بکەین بۆ دەستەی جیاجیا، بۆ نموونە بەپێی قەبارە یان دابەشبوونی جوگرافی یان پیشە یان ئاستی رۆشنبیری و زانیاری یان پەیوەستی چینایەتی.

لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەچەند خاڵێك بکەین کە بابەتی سەرەکی کۆمەڵناسین :

١- سیستەمە گشتییە کۆمەڵایەتییەکان و گرنگی بە توێژینەوەی پێکهاتەی کۆمەڵگە و ئەو گۆڕانکاریانە دەدات کە ڕوودەدات.

٢- پەیوەندی گروپە کۆمەڵایەتییەکان و تایبەتمەندی هەریەکێکیان بەستنەوەی بە کاریگەری رەفتاری کۆمەڵایەتیەوە، بەم شێوەیە کۆمەڵناسی بایەخ بە پەرەسەندنی مرۆڤ دەدات.

٣- پەیوەندییە جیاوازەکانی هاوبەندییە کۆمەڵاییەتیەکان کەلەوانەیە هاوشێوە بن وەك پەیوەندیە خێزانیەکان پەیوەندی فەرمی ، وەك پەیوەندی ئەندامەکانی کۆمەڵگە بەحکومەتەوە . بەم پێیە کۆمەڵناسی لێکۆڵینەوە لە رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی تاك لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکانی کەس و کۆمەڵیش دەگرێتەوە.

٤- ئاست و تایبەتمەندییەکانی جیاوازەکان ژیانی کۆمەڵایەتیی بابەتێکی دیکەی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی کۆمەڵناسییە لەگەڵ دروستبوونی کۆمەڵگە سەرهەڵدەدەن ( کۆمەڵناسی مرۆڤولۆژی) یان چاکسازی کۆمەڵایەتی پێ دەگوترێ .

٥- پەیوەندی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە دەکات.

٦- لێکۆڵینەوە لەبارەی تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی کۆمەڵگە پیشەسازییەکان و کاریگەریی پێشکەوتنە خێراکانی زانست و تەکنەلۆژیا لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی.

٧- لێکۆڵینەوە لەبارەی هۆکاری بزاڤ و شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکان دەکات.

٨- لێکۆڵینەوە لە بابەت و کێشە کۆمەڵایەتی، ئابووری ـ سیاسی و پەروەردەیەکان دەکات و لێکۆڵینەوە لە هۆکارە لە چوارچێوەی لەکۆمەڵگاکان و کولتوورە جیاوازەکاندا .

## جۆری کۆمەڵەکان :

دەتوانین کۆمەڵ بەپێی قەبارە بەش بەش بکەین، جا ئەگەر کۆمەڵمان بەپێی ئەو پێوانەیە بەش بەش کرد، ئەوا دەبینین کە **کۆمەڵەی گەورە** لە رووی قەبارە هەن، وەك کارگە و کێڵگە و فەرمانگە یان بەڕێوەبەرایەتییەکان کە لە ژمارەیەکی زۆر ئەندام پێك دێن، **هەروەها کۆمەڵەی قەبارە مام ناوەندی هەن** وەك کارگە و کێڵگە و یانەو کۆمپانیاکان کە لە ژمارەیەك ئەندام پێك دێن، کە ژمارەیان تا رادەیەك باشن و کەم نین، دیسان کۆمەڵەی **قەبارە بچووکیش هەن** وەك خێزان، یان خزمایەتی، یان **هاوڕێیەتی** کە لە چەند **هاوڕێ** و دۆستێك پێك دێنن.

کەواتە کۆمەڵە پێکدێت کە کۆمەڵناسی تایبەتمەندە بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و شی دەکاتەوە و دووبارە رێکخستنەوەی لە کۆمەڵ و بەشە جیاجیاکان پێکهاتووە کە تاکە کەسەکانی چەندین وابەستەی کۆمەڵایەتیی هەمیشەیی، یان کاتی

بەیەکیان دەبەستێتەوە کە پشت بە بەرژەوەند و ئامانجی هاوبەش دەبەستن، ئەو بەرژەوەندی و ئامانجەی کە ئەو بنەما و رەوشت و هەڵسەنگاندنەی کۆمەڵگە بڕیاری لەسەر دەدات و دانی پیادەنێت دیاری دەکرێن. دەبێ ئەوە بزانین کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پشت بەو زمانە دەبەستێ کە خەڵکەکە قسەی پێ دەکات، هەروەها بەو مێژووەی کە یەکێتییەکان قووڵ دەکاتەوە و بە یەکتریانەوە دەبەستێ و بەو چارەنووسە هاوبەشەی کە جۆری کاری تاکەکەسانی کۆمەڵ یەك دەخات و رەفتاریان بەرەو هێڵێکی دیاریکراو ئاراستە دەکات و ئەو دابونەریتانەی کۆمەڵە مرۆڤایەتییەکان رێك دەخات و کار دەکاتە سەر هەست و نەستیان و هەرەوەزی و تەبایی و خۆشەویستی لە نێوانیاندا بەدی دەهێنێ.

## کۆمەڵگەی مەدەنی:

ئەم زاراوەیە تا رادەیەك بە زاراوەیەکی تازە و نوێ دەناسرێت لە کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتیدا، کەچی لە راستییدا ئەم زاراوەیە لەمێژە لەلایەن بیرمەندان و زانایانی بواری کۆمەڵناسی شیکارکراوە و هەوڵی ئەوەیان داوە جیاوازییە بنەڕەتییەکان نێوان زاراوە هەمەچەشنەکانی وەك کولتوور و شارستانی و ژیاریی بەدیار بخەن.

هەموو ئەو زاراوانەش بە مەبەستی برەودانە بە بوارە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگە و ئەو قۆناغەش کە کۆمەڵگەی لە ژیانی نەزانینە و دواکەوتنەوە راگوێزا بۆ ژیانی مرۆڤایەتی و بە شارستانیی مرۆڤایەتی ناسراوە، هەندێ لە بیرمەندانی کۆمەڵناسی بیروڕایان وایە شارستانیەت وەکو چەمك پەیوەستە بە ژیانی شارنشینی و ئەو کەسانەی کە لەنێو جەرگەی شارنیشتەجێن، بەڵام ئەم بۆچوونە تا ماوەیەك باوی هەبوو کەچی دواتر جەخت لەسەر لایەنی هەڵسوکەوت و رەفتارە شارستانییەکان کرایەوە و بایەخ بە دامودەزگا مەدەنییەکان درا، هەروەها گرنگی بە رێکخستنی

ژیـان و مـافی تاکـەکان و ڕێکخـراو و سـەندیکاکان و ڕێکخـراوە ناحکومییـەکان ئاماژەیـان پێـدرا بـۆ ڕێکخـستنی ژیـان و بـەدیهێنانی ئامانجـە مـەدەنی و ڕۆشـنبیرییەکان، لـە کـاتی ئێـستاشدا زیـاتر بـۆ بەدەسـتهێنان و دەسـتەبەرکردنی مافەکانی ئافرەت و منداڵان و سەربەخۆیی هۆیەکانی ڕاگەیاندن و برەودان بە بواری پەروەردە و چەسپاندنی یاسا لە دادپەروەری کۆمەڵایەتی نێو کۆمەڵگەدا، هـەروەها گرنگی بە کەمکردنەوەی توندوتیژ دژ بە ڕەگـەزی مرۆڤـ و بـۆ بـە دیمـوکراتیکردنی کۆمەڵگە هەوڵدەدات.

بۆ ئەوەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی تازە و جـێگیر سـەرهەڵبدات ئـەوە تـەنها ئـەوە بـەس نییـە کـە بـە شـێوەیەکی شـیاو و گونجـاو لـە چـەمکی کۆمەڵگـەی مـەدەنی تێبگەین، بەڵکو دەبێ خەڵکی ئاسایی بە تامەزرۆوە بۆ چەسپاندنی ئەم سیـستەمە هەوڵبـدەن، ئـەم مەرجـە پێویـست و زەروورە لـە کاتێکدایـە کـە کۆمەڵگـە بـۆ نـاو ژیانێکی تازە و نوێ هەنگاو دەنێت، بەبێ ئەم سووربوونە کۆمەڵگە ناتوانێت بەسەر سستی و جێگیری خۆی زاڵبێت و بەرەو گۆڕان بڕوات و نەدەتوانیش خۆی لە کـۆتی دابونەریتی سواو ڕزگار بکات.

## ج – ئامانجەکانی کۆمەڵناسی:

کۆمەڵناسی لە رووی فەرمان و ئامانجەکانییەوە دەکرێت بە دوو بەشی سەرەکی کە ئەوانیش ئەمانەن:

١- **کۆمەڵناسی بیردۆزەیی.**
٢- **کۆمەڵناسی بەجێهێنان.**

### کۆمەڵناسی بیردۆزەیی:

ئەو زانستەیە کە بایەخ بە لێکۆڵینەوە و دۆزینەوە و بیردۆزەدانان لە کەڵەکەبوونی زانیارییانەی تایبەت بە کۆمەڵگە و رەفتارە کۆمەڵایەتیی و شارستانیی بە هەردوو لایەنی مادی و واتایی دەدات.

### کۆمەڵناسی بەجێهێنان:

ئەو زانستەیە کە بایەخ بە بەجێهێنانی سەرەتا و بنەڕەتە بیردۆزەییەکانی کۆمەڵناسی دەدات بۆ چارەسەرکردن و کردنەوەی گرێکوێرەی ئەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییانەی رووبەڕووی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەبنەوە، بۆ نموونە: بیردۆزەکانی پەروەردەیی بۆ قووڵکردنەوەی پەیوەندییە پەروەردەییەکانی نێوان قوتابی و مامۆستایان بەکار دەهێنرێت و هەوڵ دەدات هانی هەموو خێزانێك بدات بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانە و دەزگا فێرکارییەکان بە مەبەستی وەرگرتنی و ئەو رۆشنبیری و زانستانەی کە دەتوانرێت بۆ خزمەتگەیاندن و گەشەپێدانی کۆمەڵگە لە گشت بوارەکانی ژیاندا پشتیان پێ ببەسترێ.

**لەم بوارەدا دەتوانین گرنگترین ئەو ئامانجانە دیاری بکەین کە کۆمەڵناسی دەیەوێت بۆ مرۆڤ و کۆمەڵ و کۆمەڵگە بەدەستی بهێنێت و دەکرێت ئەو ئامانجانە لەم خاڵانەی خوارەوە دیاری بکەین:**

١- کۆمەڵناسی ئامانجی ئەوەیە کە پۆلینێکی تایبەتی بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دابنێت، کە ئەرکی بەش بەشکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بێت، ئامانجیش لەم پۆلینکردنە ئەوەیە کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندییەکی (خراپ) و دوژمنکارییەوە بگۆڕێت بۆ پەیوەندییەکی (چاك) و بەکەڵك.

٢- کۆمەڵناسی هەوڵی روونکردنەوەی بەشەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی و شیکردنەوەی رەگەزەکان و پێکهێنەرەکانی دەدات، گرنگی بە دامەزراوەی ئایینی و ئابووری و خێزانی و رامیاری و پەروەردەیی دەدات، ئەو دامەزراوانەش بەیەکەوە بەستراو و تەواوکاری یەکترن و هەر گۆڕانکارییەکیش بەسەر یەکێکیاندا بێت، ئەوا بێگومان رەنگدانەوەی خۆی لەسەر دامەزراوەکانی دیکەدا بەجێ دەهێڵێت، بەمەش دەڵێن گۆڕانی کۆمەڵایەتی.

٣- هەوڵی لێکۆڵینەوەی جۆر و شێوەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی و پاڵنەر و کاریگەرییەکانی لە تاکەکەس و کۆمەڵ دەکات و دەیەوێت لەگەڵ رەفتاری هەڵچووندا بجەنگێت و رەفتاری ژیریایەتی پتەو بکات کە لایەنە باشەکەی یەك بگرێتەوە بۆ کاریگەریی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەی مەزن.

٤- هەوڵی زانینی یاساکانی جێگیربوون و جووڵەی لەخۆوە یان گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەدات.

٥- دەیەوێت ئەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییانەی کۆمەڵگەکان بە گشتی دووچار و گیرۆدەی بوونە دەستنیشان بکات و هۆیە بابەتی و خۆییەکان و کاریگەرییە دوور و نزیکەکانی بزانێت.

٦- لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتییانەو شیکاریانە و ڕەخنەگرانەی دیاردە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەکان لە ڕووی سرووشت و هۆ و ئەنجامەکانی کە لە زەمینەی ئەو دیاردە و بارودۆخ و ئاڵۆزانەوە هەڵقووڵاون وەك لێکۆڵینەوە لە بارەی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و شۆڕش و جەنگ و چینە کۆمەڵایەتییەکان بکات.

٧- بەستنەوەی دەزگە و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕووی پەیدابوون و گەشەسەندنەوە لە نێوان ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدان کار لە یەکتری دەکەن، چونکە ئەم دامەزراوە ڕژێمانە بۆ ئەوە هاتوونەتە کایەوە تا کۆمەڵگە ڕێکخەن و تەگەرە و ناکۆکییەکان چارەسەر بکەن و پەیوەندییەکان لەگەڵ کۆمەڵگەکانی دیکەدا پتەو بکەن.

## پرسیارەکانی بەشی یەکەم

پ١ / کۆمەڵناسی چییە ؟ چۆن سەری هەڵدا ؟

پ٢/ **پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان** چییە؟ جۆرەکانیشی چین؟

پ٣/ **هۆکاری پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان چین** ؟ ئامانجەکانیشی کامانەن؟ راڤەی بکە و چەند نموونەیەکی زیندووی لە کۆمەڵگەدا بۆ بهێنە.

پ٤/ رەفتاری کۆمەڵایەتی چییە و بنچینەکانی پێکهاتنی رەفتار چییە؟

پ٥/ جۆرەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی باس بکە و وەڵامەکەت بە چەند نموونەیەك ساغ بکەرەوە.

پ٦/ باسی ئەم دەستەواژەیە بکە:

کۆمەڵناسی بریتییە لە زانستی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگە (دراسة المجتمعات)

پ٧/ ئەو خاسیەتانە روون بکەرەوە کە نووسینە کۆمەڵایەتییەکان پێش سەربەخۆبوونی کۆمەڵناسی پێی دەناسرێتەوە.

پ٨/ لەگرنگترین ئەو بیروڕا و بیردۆزانە بدوێ کە هەریەکە لە ئیبن خەلدوون و فارابی و غەزالی پێشکەشیان کردووە سەبارەت بە بەرەو پێشەوەچوون و گەشەکردنی کۆمەڵناسی لە چاخەکانی ناوەڕاست.

پ٩/ گرنگترین ئەو هۆکارانە روون بکەرەوە کە بووەتە هۆی بایەخدانی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بە کۆمەڵناسی لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا.

پ١٠/ بیروڕاکانی ئۆگست کۆنت بۆ بەرەو پێشەوەچوون و گەشەکردنی کۆمەڵناسی کە پێشکەشی کردووە چین؟ .

پ١١/ هربرت سبنسر بۆ بەرەو پێشوەچوون و گەشەکردنی کۆمەڵناسی چی پێشکەش کردووە؟

پ١٢/ ئەمیل دۆرکهایم بایەخێکی زۆری بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان داوە باسیان بکە؟

پ١٣/ لە باری کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بدوێ و خاسیەتەکانی چین؟

پ١٤/ گرنگترین ئامانجەکانی کۆمەڵناسی بژمێرە؟

# پرۆگرام و بوارەکانی کۆمەڵناسی و پەیوەندی بە زانستەکانی دیکەوە

ئەم بەشە لە بوارەکانی و بابەتە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی و پەیوەندییەکانی بە زانیارییەکانی دیکەوە دەکۆڵێتەوە.

## أ- بوارەکانی کۆمەڵناسی :

دەتوانین بوارەکانی کۆمەڵناسی بۆ سێ بەشی سەرەکی دابەش بکەین کە بریتیین لە:

### ١- لێکۆڵینەوەی خاسیەتەکانی کۆمەڵگە :

ئەم بوارە بایەخ بە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان زەمینەی کۆمەڵگە و ئاو و هەواکەی لەگەڵ دابونەریت و بەها و رەوشت دەدات، هەروەها لێکۆڵینەوە لە بارەی دابەشبوونی جوگرافی و پیشەی دانیشتوان دەکات، لەلایەکەوە گرنگی بە پەیوەندی نێوان ژمارەی دانیشتوان و قەبارەی دەرامەتی دانیشتوان دەدات لەلایەکی دیکەوە گرنگی بە قەبارەی دانیشتوان و سرووشتی ئەو پێداویستییانەی کە لە ژیانی رۆژانەی دانیشتوان پێویستیان پێیەتی دەدات. ئەمە سەرەڕای بایەخدانی ئەمجۆرە لێکۆڵینەوەیە بە تێگەیشتنی هۆکاری بابەتی و خۆیی بۆ گەشەکردنی دانیشتوان و هاوسەنگی و بزووتنەوەکەی دەدات، ئەم لێکۆڵینەوەیە کۆمەڵگەکانی مرۆڤ دابەش دەکات بۆ چەند جۆرێکی جیا بە پێی پلەی پێشکەوتنی شارستانێتییان لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ بزووتنەوەی کۆمەڵگەکان و گوێزرانەوەیان لە قۆناغێکی شارستانێتی دیاریکراو بۆ قۆناغێکی دیکە وەك، ریزبەندکردنی کۆمەڵگەکان لە جیهاندا بۆ کۆمەڵگەی

دێنشینی و کۆمەڵگەی شارنشینی و گوێزرانەوەی بەردەوامیان لە قۆناغی دێنشینییەوە بۆ قۆناغی شارنشینی، یان دابەشکردنیان بۆ کۆمەڵگەی دەرەبەگی و سەرمایەداری، و گۆڕانیان لە قۆناغی دەرەبەگییەوە بۆ سەرمایەداری و دوای ئەوەش بۆ سۆسیالیزمی.

## ٢- لێکۆڵینەوەی شیکاری بونیادی کۆمەڵایەتی :

هەموو کۆمەڵگەیەك بونیاد، یان پەیکەرێکی هەیە کە خۆی دامەزراوەی بونیادی یاخود پەیکەربەندی دەنوێنێ تێدایە کە کۆمەڵگەیان لێ پێك دێت. ئەم لێکۆڵینەوانەش بایەخ بە تێگەیشتن و شیکردنەوەی دەزگەی کۆمەڵ دەدەن وەك دامەزراوە ئابووری و رامیاری و ئایینی و خێزانی و سەربازی و پەروەردەییەکان. هەموو ئەو زانستانە لقێکن لە زانستی کۆمەڵزانی کۆمەڵناسی، وەك کۆمەڵزانی ئابووری، کۆمەڵزانی رامیاری و کۆمەڵزانی خێزانی لەبەر رۆشنایی گریمانە و بیردۆزە و یاساکانی کۆمەڵزانیدا، هەوڵی تێگەیشتنی دروستبوونی کۆمەڵ دەدەن.

## ٣- کۆمەڵزانی گشتی :

ئەم زانستە بایەخ بە کۆکردنەوە و پۆلینکردنی ئەو دەرئەنجامانە دەدات کە زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتمەندەکان پێی گەیشتوون وەك رامیاری و پەروەردە و یاسا و ئابووری و رەوشتزانی و ئایینی.

دوای ئەنجامدانی ئەم ئەرکە، کۆمەڵناسی گشتی ئەو راستییە کۆمەڵایەتییە هاوبەشانە دەستنیشان دەکات کە تیایدا و ئەو یاسا گشتییانەی کە دیاردە و کردارە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی ژیرانە و وانستیانە راڤە دەکەن و لێکدەدەنەوەو ئاشکرا دەکات.

**دوای لێکۆڵینەوەی بەشە سەرەکییەکانی کۆمەڵزانی کە تیایدا تایبەتمەندە بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیان، ئەوانیش:**

١- چەمکی کۆمەڵزانی و سرووشت و مەیدانەکان و ئامانجەکانی.

٢- پەیوەندی کۆمەڵزانی بە زانیارییەکانی دیکەوە، وەك پەیوەندی کۆمەڵزانی بە دەروونزانی و مێژوو و ئابووری و (ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی) و یاسا و تاوانزانی و جوگرافیا و زمان و فەلسەفە و ئایین و پەروەردە....تاد.

٣- لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگە بەراییییەکان (سەرەتاییەکان) و نابەراییییەکان (پێشکەوتووەکان) لە رووی بونیاد و دروستبوون و فەرمان و پەیوەندی و بیرو ئامانجەکانیان.

٤- لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و چۆنیەتی دروستبوونی ئەم پەیوەندییانە و مەبەستەکان ئەنجامەکانیان.

٥- لێکۆڵینەوەی شێوازەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی و رەگەزەکانی پێك هاتن و چۆنیەتی سەرهەڵدانی لەلایەکەوە، هەروەها بەها و نموونەی باڵا و رەوشت لەلایەکی دیکەوە.

٦- لێکۆڵینەوەی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان و جۆر و هۆ و رێگەی چارەسەرکردنیان و پەیوەندییان بە سرووشتی ئەو کۆمەڵگەیەی تێیاندا دەردەکەون.

٧- لێکۆڵینەوە لەو دامەزراوە بونیادییانەی کۆمەڵگەیان لێ پێکدێت وەك دامەزراوە ئایینی و سەربازی و خێزانی و ئابووری و رامیاری و پەروەردەییەکان.... تاد دەکۆڵێتەوە.

٨- لێکۆڵینەوەی چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و ململانێی چینایەتی و راگوێزانی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ گرنگیدان بە هۆکارە خۆیی و بابەتییەکانی سەر بە چینایەتی و چینەکانی کۆمەڵگە و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی.

٩- لە ڕێگەکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتی ناوەکی و دەرەکی دەکۆڵێتەوە وەك رای گشتی و ئایین و دابونەریت و بەهاو ویژدان و دادگا و هێزەکانی پۆلیس و ئاسایش و هێزە چەکدارەکان.

## ب - پەیوەندی کۆمەڵزانی بە زانستەکانی دیکەوە:

زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان تەواوکەری یەکترین و ئەم تەواوکەرییەش توانای شیکردنەوەی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و پێشبینی پێشوەختی رووداوەکانی داهاتووی پێدەبەخشێ، هەرچەندە زانیارییەکانی کۆمەڵایەتی تەواوکەری یەکترین، کەچی هەریەکە لەم زانیارییانە توانیویەتی پلەیەکی سەربەخۆ بۆ خۆیان دابین بکەن و لقوپۆپیان لێ بێتەوە و گەشە و نەشونما بکەن.
لەم بوارەدا پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵناسی و زانیارییەکانی کۆمەڵایەتی دەستنیشان دەکەین وەك دەروونناسی و مێژوو و ئابووری و رەچەڵەکناسی و یاسا و ئاین و زانیارییەکانی رامیاری و جوگرافی....تاد.

### ١- پەیوەندیی نێوان کۆمەڵزانی و دەروونزانی :

کۆمەڵناسی: (ئەو زانستەیە کە لە شێوەو کارو کارتێکردن و پەیوەندییەکانی نێوان کەسانی نێو کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە، سەرەڕای پەیوەندییەکانی نێوان ئەو کۆمەڵانەی کە کۆمەڵگەیان لێی پێکدێت).
کەچی دەروونزانی: (ئەو زانستەیە کە لێکۆڵینەوە لە کارتێکردنەکانی دەروون و هەستەکی و ژیرایەتی تاکەکانی کۆمەڵگە دەکۆڵێتەوە، کە هەست و بیرکردنەوە و فێربوون و زیرەکایەتی و کاردانەوەی پاڵنەرەکان و پەیوەندییان بە کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتی دەنوێنێ).

کەواتە کۆمەڵناسی لە کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە و دەروونزانیش تاکەکان دەخاتە بەر توێژینــەوە، ئەمــەش ئــەوە دەگەیــەنێ کــە نەکۆمەڵناســی لــە دەروونزانــی جیادەبێتــەوە و نــە کەسـیش لـە کۆمـەڵ دادەبڕێـت. تاکەکـەس پێویـستی بـە خزمەتگوزارییەکانی کۆمەڵە بۆ بەدەستهێنانی خواستەکانی و جێبەجێکردنی ئاواتە دوور و نزیکەکانی، کۆمەڵیش بەبێ کەسەکان پێك نایەت، چونکە ئەمانە بەردی بناغەی دروستبوونی کۆمەڵن، هەرچی نیاز و ئاواتێکیان هەیە هەر لە ناو کۆمەڵدا بۆیان دابین دەکرێت کە خواست و ئاواتی گەورەن.

## ٢- پەیوەندی مێژوو بە کۆمەڵنزانیەوە:

مێـژوو و کۆمــەڵزانی پەیوەندییەکـەی تونـد بەیـەکیان دەبەسـتێتەوە، چـونکە کۆمــەڵزانی زۆرجــار دەڕوانێتــە واقیعــی کۆمەڵایــەتی و چــۆنیەتی گەشــەکردنی کۆمەڵگـە لـە رابـردوودا، سـەرەڕای زانینـی ئەرکـەکانی و کـاری بونیادنـانی لـە رابـردوودا و دەستنیـشانکردنی رەگـەزەکانی کـە لـێ پێکهـاتووە، ئەمانـەش هەمووی بەبێ گەڕانــەوە بـۆ لاپــەڕەکانی مێـژوو نایەتــەدی، چـونکە کۆمــەڵزانی نــاتوانی دوور لــە گێڕانــەوەی مێـژوو لێکۆڵینــەوەکانی ئــەنجام بــدات و ئــەو راســتییانەی دەربــارەی کۆمــەڵ و کۆمەڵگــە لەلاپــەڕەکانی مێـژوو داڕێـژراون، کۆمەڵناس دەبێ لێکۆڵینەوەیان لـە بـارەوە بکـات و ڕاسـتیەکان لـە هەڵـە پـاك بکاتەوە، کە زۆربەی جار خزمەتی بە مەبەستەکەی دەگەیەنێ، کەواتە هۆکـاری و ڕاستکردنەوەی کاری مێژوونووسانە.

کۆمــەڵزانی پێویـستی بەهــەموو لقــەکانی مێـژوو هەیـە بـە تایبــەتی مێـژووی کەلەپووری شارستانییەتی، چونکە رۆشنایی دەخەنە سەر مێژووی نەتــەوەکان و دابونــەریتی و شـێوازی پەرسـتن و بـیروڕا ئایینــەکان سـوود لـە بیردۆزەکـانی کۆمەڵایــەتی وەربگــرن بــۆ راســتکردنەوەی لێکۆڵینــەوەکانیان بــە پێــی ئــەو یاسایانەی کە تایبەتن بە دیاردەکانی کۆمەڵایەتی.

## ٣- پەیوەندی کۆمەڵزانی بە ئابوورییەوە:

زۆربەی زۆری کێشەکانی ئابووری وەك بێکاری و گرانی و هەڵاوسان (بەرزبوونەوەی نرخەکان) و خراپی باری گوزەران و داکشانەوەی ئابووری و کێبڕکێ و قرۆخکاری و گەندەڵی، پەیوەندی بەهێزی بە هۆکارە کۆمەڵایەتی و شارستانییەکانەوە هەیە، چونکە کاردانەوە چاك و خراپەکانی بە نێو کۆمەڵدا بڵاودەبێتەوە و کاریگەری گرنگ لەسەر ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە دەکات.

کۆمەڵزانی زانستی لێکۆڵینەوەیە لە دامودەزگاکانی کۆمەڵایەتی و ئەرکەکانی بە گشتی دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە و کاریگەرییەکانی سەری لە ناوەوە و دەرەوە ئاشکرا دەکات، کەچی ئابووری تایبەتمەندە بە لێکۆڵینەوە لە سرووشت و چۆنیەتی دروستبوونی سامانی نەتەوەکان، هەروەها ئابووری بەو زانستە دەناسرێ کەبایەخ بە بەرهەم و چۆنیەتی دابەشکردنی سامان دەدات. پەیوەندییەکی توند کۆمەڵناسی بە ئابووری دەبەستێتەوە و کۆمەڵناسی زانیاری گرنگ لە زانستی ئابووری وەردەگرێ و دەیداتەوە.

کۆمەڵناسی بەو زانیارییە بنچینەیەی لەبارەی دیاردەکان هەیەتی یارمەتی ئەو بوارە ئابوورییە دەدات کە ئابووریزان پێیەوە تایبەتمەندە و لە هەمانکاتیشدا کاریگەری کۆمەڵایەتی و رەهەندی (أبعاد) هەموو دیاردەکان و گۆڕانکارییە ئابووری و داراییەکانی نێو کۆمەڵ بە ئابووریزان دەبەخشێت.

## ٤- پەیوەندی کۆمەڵزانی بە زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا (مرۆڤناسی):

ئەنترۆپۆلۆژیا ئەو زانستەیە لە مرۆڤی سەرەتایی و چۆنیەتی پێگەیشتنی زمان و بیرکردنەوەی پیشە و دابونەریت و رەفتاری پەیڕەوکراوی پەیوەندییەکانی بنەما رۆشنبیرییەکانی دەکۆڵێتەوە. هەروەها بایەخ بە کارتێکردنی باری هەرێمایەتی و ژینگە و هەلومەرجی رەخساوی کۆمەڵگە بەسەر چالاکییەکانی کۆمەڵایەتی و کەلەپووری رۆشنبیری دەدات و پەردە لەسەر هێزە

کاریگـەرەکانی لـە یەکـچوو و لەیەکنەچـووی نێـوان کیـشوەران و ژینگـەکان هەڵدەداتـــەوە و لـــە ڕێبازەکـــانی کۆمەڵایـــەتی و پلـــەی پەرەپێـــدانی شـــێوە ســـاکارەکانی کۆمەڵـــە ســـەرەتاییەکان تـــا دەگاتـــە شـــێوەکانی ئـــاڵۆزی لـــەنێو کۆمەڵگە باڵاکاندا دەکۆڵێتەوە.

ئـــەنترۆپۆلۆژیا جیـاوازی لەگـەڵ کۆمەڵزانیـدا هەیـە، چـونکە تایبەتمەنـدە بـە کۆمەڵگـە و هۆزەکـانی سـەرەتایی کـەم شارسـتانییەت، ئەوانـەی پـشت بـە کشتوکاڵ و چاندن و ڕاوەنێچیر و ڕاوەماسی دەبەستن و دەزگا و ئامێری ساکار لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاردەهێنن و دەزگاکانی کۆمەڵایەتییان ساکار و بەرچاوە و پەیوەندی کۆمەڵایەتییان زۆر سادە و ئاشکرایە.

کەچی کۆمەڵزانی بایەخ و گرنگی بە کۆمەڵگـە باڵاکـان دەدات ئەوانـەی ئاسـتی گوزەرانیـان زۆر بـەرز و چـاکە و ژیـانی کۆمەڵایـەتییان ئـاڵۆزەو کێـشەکانی شارستانییەتی و مرۆڤایەتییان زۆرە.

## ئەنترۆپۆلۆژیا و کۆمەڵزانی هەر یەکەیان پشت بە ئەویتریان دەبەستێ ؟

کۆمەڵزانی دەتـوانێ بـە وردی زانیارییـەکانی سرووشـتی و کێشەکانی قۆناغـەکانی شارستانییەتی کۆمەڵایەتی کە کۆمەڵی سەرەتایی پێدا تێدەپەڕێ پاش گۆڕانکارییە مـاددی و شارسـتانیەکان بـەو کەسـە بگەیـەنێ کـە تایبەتمەنـدە بـە لێکۆڵینـەوەی ئەنترۆپۆلۆژیا بەرامبەر بەمەش، کۆمەڵناسی زانیاری بە کـەڵك لـە بـارەی چۆنیەتی پەیـدابوونی دەزگاکـانی کۆمەڵایـەتی و بـەها و دابونەریتـەکان و سـەرهەڵدانی ئایینەکان لە ئەنترۆپۆلۆژیا وەردەگرێ.. تا کۆمەڵناسی لە سرووشتی ژیانی ئـاڵۆزی کۆمەڵایەتی تێبگات و بیانخاتە بەر شیکارکردن و لێکۆڵینەوە.

## ٥- پەیوەندی کۆمەڵزانی بە یاساوە:

(یاسا) زانستێکە بیروباوەڕە هاوبەشەکانی رۆڵەکانی کۆمەڵ و دەرهەق بە دادپەروەری و یەکسانی دەردەبڕێت و پێویستە تاکەکانی کۆمەڵگە هەمووان پابەند بن بە برگەکانییەوە و جێبەجێی بکەن، ئەم پابەندییەش دەگەڕێتەوە بۆ داڕشتنی برگەکانی یاسا بەپێی یاساکانی رەوشتی کۆمەڵ، هەروەها یاسا بەوە دەناسرێتەوە کە کە کۆمەڵە فەرمانێکە لایەنی دەسەڵاتداریەتی یاسادانان (پەرلەمان) بۆ هاووڵاتییانی خۆی دەریدەکات و لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە پشتگیری لێ دەکرێ، سزای بۆ لە رێدەرچوان و یاخیبووان لە بڕیارەکان دادەنێت.

پەیوەندی نێوان یاسا و کۆمەڵ گرنگە، چونکە کۆمەڵ سەرچاوەیەکی سەرەکیی یاسایە و یاساش بەپێی باری کۆمەڵایەتی و بەخششەکانی پەیدا دەبێت و گەشە دەسێنێت و گۆڕانکاری بەخۆوە دەبینێت.

یاسا دەسەڵات بەسەر کۆمەڵدا دەسەپێنی و شێوازی کۆمەڵ و رەوتەکانی رێبازی دیاریدەکات، چونکە هیچ کۆمەڵێك نابێ ناوی کۆمەڵی لێ بنرێ گەر کەس و رەگەزەکانی بایەخ بە یاساکانی نەدەن بۆ رێکخستنی رەفتار و جۆری کارتێکردنیان لەنێوان یەکتریدا، بەمجۆرە لە پەیوەندی نێوان ئەو دوو زانستە تێدەگەین و دەتوانین بڵێین هەموو زانستێك دەتوانێ سوود لە زانستەکانی دیکە وەربگرێ. ناتوانین زانستی یاسا و کۆمەڵناسی لە یەك جودا بکەینەوە، چونکە کۆمەڵ پێویستی بە یاسا هەیە و یاساش لە نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا نەبێ سەرکەوتوو نابێ.

## ٦- پەیوەندی کۆمەڵزانی بە خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی:

خزمەتگوزاری کۆمەڵایـەتی تایبەتـە بـە چاکسازی تاکـەکان بـۆ ئـەوەی بتـوانن خۆیان لەگەڵ بارودۆخ و هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکان بگونجێنن کە رووبـەڕوویان دەبێتەوەو پیشەیەکە هەوڵی بونیادنانی پەیوەندییـە چاکەکانی نێـوان کەسـان بەپێی چەند بنچینەیەکی راست و رەوان دەگرێتە ئەستۆ و زۆر بە ورد و قووڵی لە بارەی تاکەکانی کۆمەڵگە دەکۆڵێتەوە بۆ ئەم مەبەسـتە سـوود لـە کۆمـەڵ و تاکەکەس و دەزگاکانی دەوڵـەت وەردەگـرێ، بۆیـە خزمـەتگوزاری کۆمەڵایـەتی چارەسەر و هـەنگاو بـۆ پاراسـتنی پەیوەندییـەکانی کۆمەڵایـەتی و پتـەوکردنی گەشەسەندنی دەنێت.

کەچـی کۆمەڵناسـی بریتییـە لـەو زانسـتەی کـە رژێمـەکانی دەزگاکـان لـە نێـو کۆمەڵی ئاڵۆزدا دەخاتە بەر توێژینەوە. بۆ ئەوەی زیاتر لە جیاوازی نێـوان ئـەم دوو زانـستە حـاڵی بـبین، ئـەوا رێبـازی هەریەکـەیان سـەبارەت بـە چـۆنیەتی لێکۆڵینەوەیان لە خێزان وەك دەزگایەکی کۆمەڵایەتی دەخەینە بەرچاو..

دەبیـنین (کۆمەڵناسـی خێـزان) وەك کۆمەڵەیـەك یـان یەکەیـەکی کۆمەڵایـەتی نێـوان تاکـەکان هۆیـەکانی گۆڕانکـاری شـی دەکاتـەوە و هـەوڵی تێگەیـشتنی کاریگەریەتی نێـوان خێـزان و سیستەمەکانی کۆمەڵایـەتی هەریەکـەیان بەسـەر ئـەوی دیکـە دەدات.. وەك سیـستەمی ئـایینی ، یـان ئـابووری یـان رامیـاری.. کەچـی خزمـەتگوزرای کۆمەڵایـەتی لـە کێـشەکانی خێـزان بـە گـشتی وهـۆ و ئەنجامەکانی دەکۆڵێتەوە بەمەبەستی گەیشتن بە راسـتییەکی گشتی یارمـەتی دەدات بۆ دانانی پلانێکی سەراپاگیر و یاخود دانـانی پرۆگرامێکـی زانـستی بـۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و لابردنیان.

لـەو کێـشانەی خێـزان کـە خزمـەتگوزاری کۆمەڵایـەتی لەوانەیـە بتوانێـت چارەسەری بکات کێشەی بەخێوکردن لە خێزان بە هۆی نەمانی بەرپرسیاریەتی

خێزان لەلایەن دایك و باوکەوە بەهۆی لێك جیابوونەوەیان. هەروەها کێشەی لەرێدەرچوونی منداڵ و لادانی لە رێگای راست. خزمەتگوزاری لەم بابەتەوە رێبازی هونەری بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بەکاردێنێ و پرۆگرام و ئامۆژگاری و چاکەکاری و لێکۆڵینەوەی زانیاری بۆ ئەم مەبەستە پەیرەو دەکات، سەرەڕای چۆنیەتی سوودوەرگرتن لە دەزگاکانی چاودێری کۆمەڵایەتی بە هەموو جۆرەکانیەوە.

## ج – پرۆگرامەکانی کۆمەڵزانی:

کۆمەڵناسی پشت بە چەندین لێکۆڵینەوە دەبەستێت بۆ کۆکردنەوەی بابەتەکانی زانیاری و پۆلین و شیکردنەوەیان، بۆیەش پرۆگرامەکان ئامرازی سەرەکی کۆمەڵزانین بۆ لێکۆڵینەوەکان، لە بارەی نەشونمای کۆمەڵایەتی و پەرەپێدانی.

ئەم زانستە وا لە کۆمەڵناسی دەکات کە لە هەموو دیاردەکان و کارەکانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی ژیر و زانیارییانە تێ بگات و پەیوەندی نێوان هۆ بە ئەنجامەکانییەوە دەکاتە بنچینە بۆ لێکۆڵینەوەکانی و گرنگترین ئەو پرۆگرامانەی کۆمەڵناسی بەکاریان دەهێنێ ئەمانەن:

**١– پرۆگرامی مێژوویی.**

**٢– پرۆگرامی بەراوردکردن.**

**٣– پرۆگرامی سەیرکردن و پرۆگرامی تەماشاکردنی هاوبەش.**

**٤– پرۆگرامی رووپێوکردن.**

**٥– پرۆگرامی ئەنجام و دەرەئەنجامەکان.**

باسی هەریەکە لەم پرۆگرامانە دەکەین:

### ١- پرۆگرامی مێژوویی:

ئەم پرۆگرامە پشت بە بیروباوەڕەكانی فەلسەفەی مێژوو دەبەستێت، ئێستا و دوێنێ و دوارۆژ بە شێوەیەكی زانیاری هاوسەنگ بەیەك دەبەستێتەوە، وای بۆ دەچێ ئەگەر هاتوو لە بارودۆخی ئێستا و رابردوو تێبگەین ئەوا دەتوانین دوارۆژیش پێشبینی بكەین، دواتر دەتوانرێ هێلكاری یاساكان بكرێ كاروانی كۆمەڵگە بۆ ئەمرۆ و سبەی دیاری دەكات، جێگەی ئاماژەپێدانە كە پرۆگرامی مێژوویی لە لێكۆڵینەوەی كۆمەڵگە و دەزگە كۆمەڵایەتی و رەفتار و پەیوەندیەكان و دابونەریت و نێوان ڕابردوو و ئێستا و داهاتووت ببەستێ. ئەم پرۆگرامە باوەڕی وایە كە ناتوانرێ نە لە كۆمەڵ یان خێزان یان لە دەوڵەت و دەزگاكانی ئایینی باش تێ بگەین، گەر لاپەڕەكانی رابردوویان هەڵنەدەینەوە و باشی لێ تێبگەین، هەر كاتێ لە رابردووش گەیشتین ئەوا لە ئێستا و ئەمرۆكە تێدەگەین و دواڕۆژیش لە بەرچاو دەبێت، كەواتە دەشێ هەر دەزگایەك یان دیاردەیەك یان زانیارییەكی كۆمەڵایەتی بخرێتە بەر لێكۆڵینەوەی مێژووی تا بنچینە و رەوتە و گۆڕانكارییەكانی سەر كۆمەڵگە دیاری بكرێت.

### ٢- پرۆگرامی بەراووردكاری:

ئەو ڕێگەیەی كە كۆمەڵزانی لە لێكۆڵینەوەی كۆمەڵگە پشتی پێدەبەستێ كە سیستەم و دابونەریت و بەهاكان لەخۆدەگرێت، پرۆگرامی بەراووردكاری توێژینەوە لە دیاردە و دەزگاكانی كۆمەڵ لەمیانەی بەراووردكردنی نێوان ئێستا و رابردوویان لە نێو یەك كۆمەڵگەدا دەكات، وەك بەراووردكردنی باری خێزانێكی عێراقی لە ساڵی ١٩٥٠ لەگەڵ باری خێزانی ئەمساڵ، هەروەها لە میانەی لێكۆڵینەوەكانیدا ئەم پرۆگرامە بەراورد لە نێوان دیاردە و دەزگاكانی نێوان چەندین كۆمەڵگەی لێك جیاواز لەیەك كات و ساتدا دەكات، وەك بەراوردی نێوان چۆنیەتی بونیادنانی خێزانێكی كۆمەڵگەی عێراقی و ئەركەكانی

لەگەڵ خێزانێکی کۆمەڵگەی میسری یان کۆمەڵگەی بەریتانی یان فەرەنسایی لەم کات و سەردەمەدا.

پاش ئەم بەراوردکردنە کۆمەڵناس چەند یاسایەکی گشتی بۆ شیکردنەوەی دیاردە و دەزگاکان بە شێوەیەکی گشتی ئەنجام دەدات و هەموو پەیوەندییەکانی پەیوەست بەخۆیەوە روون دەکاتەوە وەك تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە و کێشەکان و رەوتەکان، کەواتە پرۆگرامی بەراوردکاری پرۆگرامێکی گرنگی توێژینەوە دیاردە و دەزگاکانە بە شێوەیەکی زانیارییانەی تایبەتمەند، چونکە لە رێگەی ئەم بەراوردکردنەوە شارەزایی ئاستی پێشکەوتن و دواکەوتنی کۆمەڵگە دەبین و لایەنەکانی ژیانی دیاری دەکرێ.

## ٣- پرۆگرامی سەیرکردن و تەماشاکردنی هاوبەش:

پرۆگرامی سەیرکردن گرنگترین رێبازی کۆمەڵزانی بەکاری دێنێ بۆ لێکۆڵینەوە لە راستییەکان و تێگەیشتنی لە بوارە کۆمەڵایەتیەکان کە زانیاری پێویست دەبەخشێتە توێژەر تەماشاکردن شێوازێکە لە شێوازەکانی زانیاری هیچی لە چاوپێکەوتنی فەرمی و نافەرمی یان لە لێکۆڵینەوەی راستییەکان و زانیارییەکانی تاکەکەس و کۆمەڵ کەمتر نییە.

ئەم رێبازە دەرفەت لەبەردەم توێژەری کۆمەڵایەتی خۆش دەکات بۆ بینینی بارودۆخی ئاسایی و دروست نەکراوی ئەو کۆمەڵەی توێژینەوەیان لە بارەوە دەکات. یەکێك لە مەرجەکانی ئەم پرۆگرامە ئەوەیە ئەو کەسانەی دەکەونە بەر توێژینەوەکە نابێ هەست بەوە بکەن کە رەفتار و پەیوەندی و هەڵسوکەوتیان و باری ئاسایی رۆژانەیان خراوەتە ژێر چاودێرییەوە، هەر بۆیەش دەبێ توێژەرەکە هەڵسوکەوتی ئاسایی بێ پەیوەندی و تێکەڵبوونی دروست بێت و دوور بێت لە دەستکردی و بەئەرك بوون.

بەمــەش کەســی توێــژەر دەتــوانێ لــە بــارەی ژیانیــان بکۆڵێتــەوە دوور لــە دەســتێوەردانی هێزێکــی دەرەوە، ئــەم لێکۆڵینــەوە پــشت بــە تەماشــاکردن و ســەرنجدان لــە دیاردەکــان و کێــشەکانی بەرچــاو دەبەســتێ، تەماشــاکردنی هاوبەشیش بە بەشداری توێژەر لـە ژیـانی خەڵکیـدا دێتـەدی و توێـژەر دەسـت دەکات بە تێبینی کردنیان بەشێوەیەکی کـاتی بەشـداریش لـە چـالاکییەکانیان دەکات وەکو بەشداریکردن لە چالاکی ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان.

لەم جۆرە تەماشاکردنە دەبێ توێژەر یەکێك بێ لە ئەندامەکانی ئـەو کۆمەڵـەی کە توێژینەوەی لەسەر دەکرێت بەبێ ئـەوەی بـە بارودۆخیـان تـێ بپـەڕێ واتـە (ژیانێکی ئاساییان لەگەڵ بەسەرببات) و بکەوێتـە ژێـر رکێفـی کاریگەرییـەکانی سـەریان و نـابێ ناسـنامەکەی وەك توێـژەرێك ئاشـکرا بکـات تـا کۆمەڵەکـە بـە ئاسایی دوور لە دەستکردەیی و لە خۆبایی رەفتار بکەن، لە هەمانکاتـدا دەبـێ ئەو کەسەی کە بەم توێژینەوە هەڵدەستێ چوست و چالاك و زیرەك بێت و ئـەو شتانە تۆمار بکات کە گرنگن و لەگـەڵ خـەڵکی بـە شـێوەیەکی فـەرمی رەفتـار نەکات تا راستییە خودی و بابەتەکی کۆمەڵەکەی بەدەست بکەوێت.

## ٤- پرۆگرامی روو پێوکردن:

ئەم پرۆگرامە گرنگترین و تازەترین رێبازی کۆمەڵزانییە کـە بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە دیاردەکـان و دەزگاکـان و چـەند رێگایـەك بـۆ کۆکردنـەوەی زانیارییـەکان و شـیکردنەوەیان بـەکاردێنێ و دەسـتەیەك بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەڵدەبـژێرێ و لـە لیستەیەکدا زانیارییەکان تۆمار دەکات و چـاوپێکەوتنی رووبـەڕوو و راسـتەوخۆ بۆ بەرجەستەکردنی زانیارییەکان و ئامارکردن و شیکردنەوەیان بـە شـێوەیەکی ئامارگیری پەیرەو دەکات.

**قۆناغەکانی پەیڕەوکراوی ئەم پرۆگرامە ئەمانەن:**

أ- دەستنیشانکردنی کێشە و بابەتی لێکۆڵینەوەکە.

ب-دیاریکردنی چەمك و زاراوەکانی زانیاری تایبەت بە لێکۆڵینەوە.

ج- دیارکردنی دەستەی ئامارگیری، ئەویش لە ڕێگەی دەستنیشانکردنی جۆر و ئاست و قەبارەی ئەو ناوچەیەی کە دەستنیشانکراوە.

د- ئامادەکردنی فۆرمی زانیارییەکان وەك ئامرازێکی سەرەکی لێکۆڵینەوە و پێوانەکردن.

هـ - سازدانی چاوپێکەوتنی فەرمی و نافەرمی.

و - کۆکردنەوەی زانیارییەکانی نێو فۆرمەکە بە شێوەی هێمایەك وەك: ژمارەیەك یان بە پیتێك و پێکهێنانی چەند شەقڵێك لێیانەوە لە جیاتی ناوی کەسەکە و شوێنی نیشتەجێبوونی، دەتوانرێ هێمایەك لە خشتەی ئامارگیرییە تایبەتیەکە دابنرێ.

ز- کرداری شیکردنەوە ئامارگیری لەم قۆناغەدا زانیارییەکانی کۆمەڵ کە لە نێو خانەکاندا تۆمارکراون دەخرێنە بەر شیکردنەوە تا ڕادە و ڕێژەی لێکۆڵینەوەکە دیاری بکرێ لە ڕێگەی ڕێژەی سەدی و ناوەندی و ژمێریاریکردن.

ی- لە کۆتاییدا ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە لە نێو ڕاپۆرتێکدا تۆمار دەکرێت.

**٥- پرۆگرامی ئەنجام و دەرئەنجام:**

ئەم پرۆگرامە لە گۆڕانکاری و هێزی کارتێکردنی بەسەر کۆمەڵ و بونیادنانی کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە و ئەنجامی دەدات.

## پرۆگرامی ئەنجامدان:

شێوازێکە لە شێوازەکانی هزرو بیری ژیرانە لە بارەی تێبینیکردنی کۆمەڵە راستییەکی سەربەخۆی لە یەك جودای تایبەت بە بابەتێك یان چەند بابەتێکی جیاجیا. کاتێ توێژەر لە کۆمەڵە راستییەکی باری ئابووری خێزان و پەروەردە و ئایین و کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە، دەتوانێ پشت بەمجۆرە پرۆگرامە ببەستێ بۆ گەیشتن بە چەند زانیارییەکی گشتی تایبەت بە کۆمەڵ و ئەنجامەکەی دەتوانێ زۆربەی زۆری کێشەکان شیبکاتەوە و پێشبینی رووداوەکانی داهاتووی باری کۆمەڵ بکات و رادەی زێدەبوونی تاوانکاری و دیاردەی لەت لەتبوونی خێزان و لەرێدەرچوونی لاوان و جیابوونەوەی ژن و مێرد...تاد.

## پرۆگرامی دەرئەنجام:

پشت بە لێکۆڵینەوەی گشت و تێکرا دەبەستێ بۆ پالاوتنی ئەو تاکە راستییانەی کە کار لە گشت دەکەن و شێوازێکی تایبەتی پێ دەبەخشن.
کەواتە دەرئەنجام لە گشتەوە بەرەو تایبەت دەست پێدەکات، کەچی ئەنجامیەتی لە تایبەتەوە روو دەکاتە گشت.

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

پ١/ گرنگترین بوارەکانی کۆمەڵناسی کە پێیەوە تایبەتمەندە دەستنیشان بکە ؟

پ٢/ باسی پەیوەندی نێوان کۆمەڵناسی و دەروناسی بکە؟

پ٣/ ئایا دەتوانین کۆمەڵناسی لە زانیارییەکانی دیکە جیا بکەینەوە؟

پ٤/ چ پەیوەندییەك مێژوو بە کۆمەڵناسی دەبەستێتەوە؟

پ٥/ باسی پەیوەندی کارتێکردنی نێوان ئابووری و کۆمەڵناسی دیاری بکە؟

پ٦/ ئەنترۆپۆلۆژیا و کۆمەڵناسی جیاوازییان هەیە، بەڵام پەیوەندیشیان بەیەکەوە هەیە؟

پ٧/ باسی گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵناسی و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی بکە.

پ٨/ بۆچی کۆمەڵناسی لە لێکۆڵینەوەکانیدا چەند پرۆگرامێکی زانیاری بەکاردەهێنێ.

پ٩/ گرنگترین ئەو پرۆگرامانە بژمێرە کە کۆمەڵناسی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکات و یەکێکیان باس بکە؟

پ١٠/ پرۆگرامی مێژوویی چۆن لە کۆمەڵگە دەکۆڵێتەوە؟

پ١١/ چۆن پرۆگرامی بەراوردی لە کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە؟

پ١٢/ باسی ئەو هونەرانە بکە کە بەکاردێ بۆ پرۆگرامی تەماشاکردنی بە هاوبەشی لە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و راستییەکان، پ – ١٣/ باسی گرنگترین قۆناغەکانی پرۆگرامی رووپێوکردن بکە ئەوانەی کە توێژەر پێیەوە پابەندە؟

پ١٤/ جیاوازی نێوان پرۆگرامی ئەنجامدان و دەرەئەنجام چییە؟

# دەزگا کۆمەڵایەتییەکان

هـەموو کۆمەڵگەیـەك بنەمایـەکی کۆمەڵایـەتی هەیـە کـە لـە چـەند دەزگایـەکی کۆمەڵایەتی بونیادگەری پێك هاتووە، ئەو دەزگایانەش مەبەست و ئامـانجی خۆیـان هەیە وەك دەزگاکانی ئایینی و خێزانـی و پـەروەردەیی و کۆمەڵایـەتی و رامیـاری و سـەربازی. دەتـوانرێ بـەم شـێوەیە دەزگاکـان پێناسـە بکرێـت: **دەزگـا کۆمەڵایەتییەکان لە هەندێ رێسا و رێوشوێن و چەسپێنەر پێکهاتوون کە رەوشـتی کەسەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەناو کۆمـەڵ یـان رێکخراوەکانـدا دیـاری دەکات وەك خێزان و سوپا و مزگەوت و کارگە و کێڵگە و یانە...تاد.**

هەر دەزگایەکی کۆمەڵایەتی لە چـەند رۆڵێکـی کۆمەڵایـەتی پێکـدێت و هەریەکـەیان سەبارەت بە پایـە و گرنگییـان و لێپرسـراویەتی سەرشـانیان لـە یـەکتری جـودان و هەندێکیان رۆڵی رابەرێتی یان مامناوەندی یان رۆڵی سەرەتایی بە خـۆوە دەبیـنن.. بـاوك رۆڵـی رابەریـەتی لـە خێـزان دەگێڕێـت کەچـی کـوڕە گـەورەکانی رۆڵـی مامناوەندییان بەردەکەوێ، کـوڕە بـچووکەکانی رۆڵێکـی سـادە لـە خێـزان دەبـینن، ئەمانە هەموویان بە تێکڕا تەواوکەری یەکترین و هەر رۆڵێك تەواوکەری ئەویترە چ لە بارەی گرنگییەکان و چ لە بارەی ئەرکی سەرشانیان.

هەریەك لەم رۆڵانەی ژیان و مافی کۆمەڵایەتی خـۆی هەیـە و دەبـێ بـۆ دابینکردنـی دادپەروەری کۆمەڵایەتی نێو دەزگاکان هاوسـەنگی لـە نێـوان ئەرکـەکان مافـەکانی پەیرەو بکرێت، چونکە هەموو ئەندامێکی نێودەزگا کۆمەڵایەتییەکان چەند ئەرکێکی لەسەرە و لە بەرامبەریشدا پێویستە مافەکانی بۆ دابین بکرێت. لە پێناو بەدیهێنانی ئەم مەبەستە لەم چەند دەزگایانە دەکۆڵینەوە.

## یەکەم: دەزگای خێزان

خێزان بریتییە لە بچووکترین دەزگای کۆمەڵایەتی کە لە چەند کەسێك پێکهاتووە و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و خوێنی و گیانی بەیەکەوەیی بەستاون، هەر ئەم پەیوەندییانەیە کە خێزانی مرۆڤایەتی لە خێزانی ئاژەڵ جیا کردۆتەوە، خێزانی ئاژەڵ هیچ جۆرە دیاردە و مەرجێکی ڕەوشتییان تێدا نییە و ملکەچن بۆ هەموو جۆرە ڕەمەك (غریزة) و ئارەزوویەکی بایۆلۆژی سروشتی. جۆری پەیوەندی نێوانیان زۆر ساکارە، کەچی خێزانی مرۆڤایەتی یاسا و پەیوەندی و ڕەوشت و نەریتی پێشکەوتووانەی هەیە کە کۆمەڵگە بڕیاری لەسەر دەدات و باوەڕی پێیەتی.

ئەم دابونەریت و پەیوەندییەش دەورێکی باڵا دەگێڕێت لە پێشکەوتنی مرۆڤ و هەموو دەستە و تاقمێکی کۆمەڵگە. هەوڵیش دەدات کە ئەو خواستانە بێنێتە دی کە بە دوایدا وێڵن بەبێ جیاوازی جۆری چینایەتی و نەتەوایەتییان. مرۆڤ سرووشتێکی کۆمەڵایەتیی هەیە، چونکە هەمیشە ئارەزووی لەوەیە لەگەڵ کۆمەڵگەدا بژی و ناتوانی بە تەنیا و دوور لە خەڵك هەڵبکات، حەزیشی لەوەیە کە پەیوەندی لەگەڵ هاوجۆرەکانیدا دروست بکات، بەم کارەش دەستە و کۆمەڵی کۆمەڵایەتی جیاواز و بەیەکداچوو پێکدەهێنێت کە سادەترینیان لە شێوەی خێزانە و فروانترینیانیش خۆی لە شێوەی مرۆڤایەتییەکی بەربڵاو و جیاواز دەبینێتەوە.

خێزان ئیمڕۆ پلە و پایەیەکی دیار و گرنگی لە کۆمەڵگەدا هەیە و بەشێکی بنەڕەتییە لە بوون و قەوارەی کۆمەڵگەی نوێ، بەم جۆرەیش بیروهەست و هۆشی کەسانی کۆمەڵگە فراوان دەبێ و بەرەو پێشکەوتن هەنگاو دەنێ، دوای ئەوەی کە دابی کۆمەڵایەتی پەرەدەسێنێت و گەشە دەکات بەو جۆرەی کە پێویستییەتی، بەرگریشی لێدەکات لەو گیروگرفت و دژوارییانەی کە لە کۆمەڵگەئاڵۆزە بەیەکداچووەکەیدا رووی تێدەکات.

خێزان بریتییە لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی پتەو لە ناو جەرگەی نەتەوە و کۆمەڵگە دروست بووە، بەڵکو بەو پەڕی بەهێزی پەیوەندیی بە قوتابخانە و پەیمانگە و کارگە و مزگەوت و یانە و دەزگا رامیاری و سەرجەم دەستە و تاقمە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە، کۆمەڵگەی گەورە بەرپرسیارە بەرامبەر بە خێزان و هەموو جۆرە پەیوەندییەکی نەپساویان لەگەڵدا هەیە. دوو جۆر خێزان هەیە خێزانی بچووك و خێزانی گەورە لە خوارەوە باسیان دەکەین:

### خێزانی بچووك:

خێزانی بچووك پێکهاتووە لە دایك و باوك و منداڵەکانی لەماڵێکدا بە یەکەوە دەژین، بە هۆی پێداویستی و بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەنگژەی نیشتەجێبوون بچووك دەبنەوە ئەمجۆرە خێزانە زۆرتر لە کۆمەڵگەی شارستانی نوێ بەرچاو دەکەوێ.



## خێزانی گەورە:

ئەم جۆرە خێزانە جگە لە دایك و باوك و منداڵەکان و داپیر و باپیر و منداڵەکان و کەسانی دیکە پێك دێت، ئەم شێوە خێزانەش زیاتر لە کۆمەڵگەی کۆن و کشتوکاڵییەکان بەرچاو دەکەوێ، بەهۆی گرنگی کار و کردەوەکان و شێوازی سادەی گوزەرانیان.

### ئەم خاڵانەی خوارەوەش چەند فەرمانێکن کە خێزان پێشکەشی تاکەکان و کۆمەڵگەی دەکات:

١- دابینکردنی خانووبەرە و شوێنی حەوانەوە بە کەلوپەلی پێویستەوە.

٢- پێگەیاندنی منداڵ لەسەر پێگەیاندنێکی کۆمەڵایەتی و ئاینی و رەوشتی و بەهای پیرۆز و راهاتنیان لەسەر ئەو ئیش و کارانەی کە لە رێگەیەوە خزمەتی کۆمەڵگەی پێدەکەن.

٣- بەرگریکردن لە ئەندامەکانی خێزان و پاراستنیان لە هەموو جۆرە مەترسییەکی دەرەوە کە بەرەو روویان دەبێتەوە.

٤- رێکخستنی پەیوەندییەکانی ژنهێنان و هاوسەرگیری تا منداڵان لەدایك ببن، چونکە ئەمانە ئاواتی ئەمرۆ و سبەی نەتەوەن.

٥- راهێنانی ئەندامەکان بە دابونەریت و خوورەوشت و بەها چاکەکان لە کاتی پەروەردەکردنی منداڵ بۆ ئەوەی کولتوور و شارستانێتی کۆمەڵایەتی نەگۆڕێ و لەناو نەچێت.

٦- دەبێ خێزان بە ئەرکی ئابووری رۆڵەکانی خۆی هەڵبستێ و خەرجی رۆژانەیان بۆ دابین بکات، جگە لەوەش خێزان کار بە ئەندامانیان دەسپێرێ تا پێداویستی رۆژانەیان بۆ دابین بکرێت.

٧- خێزان و قوتابخانه به دوو قۆڵی و شانبەشانی یەکتر لە ئـەرکی پـەروەردەیی و فێرکاری بەشداری دەکەن. ئەرکی خێزانە منداڵەکانی لە قوتابخانە و خوێنـدنگا دابنێ و ناویـان تۆمـار بکـات بـۆ فێربـوونی خوێنـدن و نووسـین، جگـە لـەوەش پێداویستی فێربوونیان بۆ دابین بکرێت و هانیان بدات بۆ فێربوون.

٨- پێویستە ئاگاداری بـاری تەندروسـتی ڕۆڵـەکانی بێـت و خـۆراك و خواردەمـەنی چاکیان بۆ ئامادە بکات تا باری تەندروستیان لەو پەڕی چاکیدا بێت، ئەویش بە تەرخانکردنی جێگای چاك و پاك و خاوێن بۆ نەخۆشی ناوماڵ و خزمەتکردنی.

٩- پێویستە خێزان کردار و چالاکی چاك بـۆ ڕۆڵـەکانی ئامـادە بکـات، تـا کاتیـان بـەفیڕۆ نەچـێت و فێـری چـاکە و کـاری بـاش بـبن بەشـێوەیەك کـە خزمـەتی کۆمەڵگەیان پێ بکرێت.

١٠- دەبێ خێزان لە ڕێگـای زاوزێـوە ئەنـدامی پێویـست بـۆ کۆمەڵگـە دابـین بکـات، چونکە ئەمانە بەردی بناغەی سەرەکی کۆمـەڵن چ لـە بـارەی بەرهـەمهێنان یـان پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری و بەرگریکردن لە نیشتمان و نەتـەوە و پاراسـتنی خاکەکەی.

### دووەم: دەزگاکانی ئابووری

**دەزگای ئابووری بریتییە لە: (کۆمەڵێ یاسا و ڕێوشوێن و چەسپێنەر کـە ڕەوشـتی کۆمەڵایـەتی و پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانی مرۆڤـ لـە ڕێکخـراوە بەرهەمـداری و کارگوزارییەکانـدا دیـاری دەکـات وەك کارگـە و کێڵگـە و کۆمپانیـا و شـوێنە بازرگانییەکان و بانك)....تاد.**

دەزگـا ئابوورییـەکان لـە چـوار کـەرتی سـەرەکی پێکـدێن کـە بـریتین لـە (کـەرتی کـشتوکاڵی و کـەرتی پیـشەسازی و کـەرتی بازرگـانی و کـەرتی کـارگوزاری) ئـەم

کەرتانەش مولکی کەرتی گشتی یان کەرتی سۆسیالیستی و کەرتی تێکەڵاو و کەرتی تایبەتین.

دەوڵەت کە خاوەنی کەرتی گشتیی ئابوورییە سەرپەرشتی سەرجەم کەرتەکانی دیکە دەکات و چاودێری لە چالاکییەکانی ئابووری دەکات کە لە خزمەتی کۆمەڵدا بێت و ئامانجە سەرەکییەکانی کۆمەڵ بەدی بهێنێت، بەو واتایەی کە دەوڵەت زۆر بایەخ بە قازانج نادات، بەڵکو گرنگی بە دابینکردنی شتومەکی جۆراوجۆر و چاك و نایاب دەدات، لەهەمان کاتیشدا نرخی شتەکان بەپێی داهاتی هاوولاتیان بە یەکسانی دیاری دەکات و چاودێری لە بەرووبووم دەکات تا فرۆفێڵی تێ نەکەوێت پێش ئەوەی بخرێتە نێو بازاڕ سەرباری ئەوەی دەوڵەت کاری هەڵگرتنی کەرستە بە ئەنقەست بەمەبەستی تەماعکاری و قازانجی زیاتر قەدەغە دەکات.

**رەگەزە سەرەکییەکانی کارگەیەك لە دەزگای ئابووری لەم بەشانە پێکدێت:-**

١- هەر کارگەیەك چەند بەشێکی جیاجیای لێ دەبێتەوە و هەریەکە لەم بەشانەش بە جۆرە پیشە و فەرمانێك تایبەتمەندە وەك بەشی بەروبووم و بەشی کڕین و بەشی فرۆشتن و بەشی دارایی و بەشی پروپاگەندە و راگەیاندن و بەشی ژمێرکاری و بەشی لێکۆڵینەوە..تاد.

هەرچەندە ئەم بەشانە لەیەك جیاوازن، بەڵام لەکاردا بە تێکڕای تەواوکەری یەکترین بۆ وەدەستهێنانی بەرهەم و جێبەجێکردنی ئامانجەکانی دەزگاکەیە.

٢- هەڵوەشاندنەوەی هەر بەشێك لە بەشەکانی کارگە بۆ نموونە - بەشی بەرهەمهێنان - چەند رۆڵێکی گرنگی هەیە و هەموو رۆڵەکانیش تەواوکاری یەکترین وەك رۆڵی بەڕێوەبەر و رۆڵی یاریدەدەر و رۆڵی ئەندازیار و رۆڵی سەرپەرشتیکار و رۆڵی کرێکار و رۆڵی شارەزا و رۆڵی کرێکاران...تاد.

٣- هەریەکە لەم رۆڵانە ئەرك و مافی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ نموونە بەڕێوەبەر و ئەندازیار بەپێی یاسا ئەرکیان لەسەرە و لە هەمانکاتیشدا مافی دابینکاری و داراییان هەیە دەبێ هاوسەنگی لە نێوان مافەکان و ئەرکەکان پەیڕەو بکرێ و نابێ لاسەنگ بێت، بەمجۆرەش دەبێ فەرمانبەر لە کارەکەیدا بە وەفا و دڵسۆز بێ و خۆی بۆ خزمەتکردنی دەزگاکە و جێبەجێکردنی ئامانجەکانی تەرخان بکات، لە هەمانکاتیشدا پێویستە کارگە هەموو مافێکی دارایی و دابینکاری کۆمەڵایەتی بۆ دابین بکات.

## ئامانجەکانی دەزگای ئابووری:

١- زیادکردن و فەراهەمکردنی بەرهەمهێنان وکەرستەی بەرهەمداری و بەکاربردن کە کۆمەڵگە پێویستی پێیەتی لە بارەی چەندێتی و جۆری دیاریکراو.

٢- دابەشکردنی کەلوپەل بەسەر بازاڕدا بەمەبەستی فرۆشتنیان بە بازرگانەکان تا بگاتە دەستی کڕیار، و دابینکردنی پێداویستییەکان.

٣- هەوڵدەدات چەند بنچینەیەکی دارایی بەسەر پیشەسازی و کشتوکاڵی ئاڵوگۆڕ و بازرگانیەتی پەیڕەو بکرێت.

٤- رێکخستن و چاودێریکردنی خزمەتگوزارییەکانی بەپێی پێداویستییەکانی تاکەکەس و کۆمەڵ و دەزگاکان.

٥- هەوڵدەدات هاوسەنگی نێوان داهاتی هاووڵاتی و بەهای کەلوپەل رەچاو بکرێت تا ئاستی گوزەران لاسەنگ نەبێ و توانای کڕین لەلای هاووڵاتیان لاواز نەبێ.

٦- راهێنانی کارمەند و کارگێڕان لە دەزگاکانی ئابووریدا بەو شێوەیەی کە ئاستی بەرهەمەکە زیاد بکەن و جۆرەکەی چاك بکەن.

٧- پاراستنی بەهای دراوی نیشتمانی بەرامبەر بە نرخ و بەهای دراوی بیانی، ئەم هاوسەنگییەش لە نێوان داهات و دەرامەت و هاوسەنگی نێوان بەرهەم و وەبەرهێنانی نێوان کڕین و فرۆشتنی کەلوپەل دێتە دی.

٨- هەوڵدانی بەردەوام بۆ وەدەستهێنانی باری ئابووری و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان لەمیانەی زێدەکردنی بەروبووم و چاککردنی باری گوزەران و تەرخانکردنی مووچەی پێویست لەگەڵ جێگیرکردنی نرخ و بەهای کەلوپەل.

٩- زیادکردنی ڕێژەی بەرووبوومی ئابووری جا چ کشتوکاڵ بێت یان پیشەسازی، ئەم ئامانجەش بە بەکارهێنانی ئامێری تازەی کشتوکاڵ و پیشەسازی دێتەدی.

١٠- ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانی ئابووری و چارەسەرکردنی بێکاری و تەشەنەکردنی گرفتی دارایی و کەمی بوودجە و بێ پارەیی و کێشەی هەڵاوسان و گرانی بازاڕ.

## سێیەم: دەزگا رامیارییەکان:

دەزگای رامیاری بە گرنگترین دەزگاکانی بنەما کۆمەڵایەتییەکان دادەنرێت لە کۆمەڵگەی نوێدا، چونکە بەرپرسیاری چارەسەرکردنی کرداری حوکمڕانییە لە کۆمەڵگەدا کە دەبێتە مایەی سەرفرازی و ئاشتی و ئاسوودەیی لە نێو هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەدا.





**دەزگا رامیاریش بریتییە لە:**

**(کۆمەڵی یاسا و ڕێسا کە پەیوەندی چۆنیەتی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی تاکە کەسان دیاری دەکات لە سیستەمە رامیارییەکاندا وەك پارت و دەسەڵاتی سیاسی و بەشەکانی دەوڵەت بە هەموو جۆر و پسپۆرییەکانینەوە).**

شایانی باسە دەزگای رامیاری تەواوکاری دەزگاکانی دیکەیە کە کۆمەڵگەی لێ پێکدێت، وەك دەزگای ئابووری و دەزگای پەروەردەیی و دەزگای ئایینی. دەتوانرێ بەشەکانی دەزگای رامیاری شی بکرێنەوە، بەپێی ئەو بەشانەی لێی پێکهاتووە، هەروەها ئەو وەزارەتانەی کە حکوومەت پێکدێنن بۆ نموونە وەك شیکردنەوەی وەزارەتی بەرگری بۆ چەند لقێك یان چەند بەشێك و شیکردنەوەی لقێکیش بۆ چەند دەورێك و هەر رۆڵێکیش بۆ چەند ئەرك و مافێك شی دەکرێتەوە. کاری ئەم دەزگایە پاراستن و ڕێگرتنە لە کاری دوژمنکاری دژ بە کۆمەڵگە و نەهێشتنی مەترسی دەرەکی و ناوەخۆیە.

**گرنگترین ئەو فرمانانەش کە دەوڵەت وەك دەزگایەکی رامیاری پێشکەش بە تاك و کۆمەڵگەی دەکات ئەمانەی خوارەوەیە:**

١- بەرگرییکردن لە وڵات بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی چەکدار لە هەر دەستدرێژکارییەکی داگیرکاران و پاراستنی شکۆمەندی نیشتمان و هێمنی و ئاسایشی هاووڵاتیان لە هەر دوژمنکارییەکی بەرامبەر .

٢- ئاسایش و ئاسوودەیی ناوخۆ لەئەستۆ دەگرێت، بۆ ئەوەی کەسانی دەروون لاواز و لەڕێدەرچووان ئاسایشی ناوخۆ تێك نەدەن و ئەمکارەش دەزگاکانی ئاسایشی ناوخۆ و دەزگاکانی دادوەری پێی هەڵدەستن.

٣- دەزگای رامیاری خزمەتگوزاری ئابووری ڕێکدەخات وەك دابینکردنی کارو ڕێکخستنی کاری بەرهەمهێنان و دابەشکردنی بەرهەم و دابینکردنی هاوسەنگی

لە نێوان داهاتی هاووڵاتی و نرخی شتومەك و چارەسەرکردنی کێشەکانی ئابووری و بونیادنانی بناغەیەکی بەتینی ئابووری بۆ هەموو کەرتەکانی ئابووری و چوست و چالاککردنی بازرگانی ناوخۆ و دەرەوە.

٤- گرنگیدان بە فەلسەفەی پەروەردەیی و فێرکردن لە نێو چینەکانی گەل لە رێگای دروستکردنی قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگاکان و کردنەوەی خولی زانستی و زانیاری و راهێنانی هونەری و هاندانی قوتابییان بۆ سوود وەرگرتن لە کتێبخانەکاندا.

٥- بایەخدان بە باری تەندروستی تاکەکانی کۆمەڵگە لە رێگەی کردنەوەی نەخۆشخانە و بنکەکانی تەندروستی و دەرمانخانەکان، سەرەڕای دامەزراندنی کۆلیژی پزیشکایەتی بۆ قەڵاچۆکردنی هەموو جۆرە نەخۆشییە مەترسیدارەکان، هەروەها دابینکردنی پێداویستییەکانی تەندروستی گشتی.

٦- تەرخانکردنی خزمەتگوزارییەکانی کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵ و ئەو کەسانەی رووبەڕووی گرفتی کۆمەڵایەتی دەبنەوە و دۆزینەوەی رێوشوێنی لەبار بۆ گرفتەکانیان.

٧- پڕکردنەوەی کاتی بەفیڕۆچووی هاووڵاتیان بە جموجۆڵ و چالاکی بەسوود تا کاری داهێنان و تواناکانیان لە بارەی چالاکییەکاندا گەشە بکات و کەسانی شیاویان لێ دروست بێ و ئەم چالاکییانەش خۆیان لە وەرزش و هونەر و وێژە و زانیاری ...تاد. دەنوێنن.

٨- نەهێشتنی کاری رەگەزپەرستیی و جیاوازی نەتەوایەتی هاووڵاتیان و پەرچدانەوەی ئەوانەی لایەنگیری و پشتگیری ئەم بیروڕایانە دەکەن.

٩- لە پێناو دابینکردنی باروردۆخێکی هاریکاری لە نێوان رۆڵەکانی گەل و دەوڵەت کار دەکات، دابینکردنی کاری خزمەتگوزاری چاك بۆ هاووڵاتیان دێتەدی دەبێ

لایـەنی کارمەنـد و کـارگێڕان بـۆ خزمـەتکردنی بەسـەرکەوتووی بـەڕێوەببات و بەرگری لە پڕۆگرامەکانی پەرەپێدان و خزمەتگوزاری و ئاسایش بکات.

١٠- دەوڵەت بە رووی شاڵاوی رۆشنبیری بیانی دەوەستێت کـە مەبەسـت لێیانـەوە شـێواندنی ناسـنامەی هاووڵاتیانـە و لاوازکردنـی کـاری بونیادنـان و وەسـتانی کـاروانی ئاوەدانکردنەوەیـە، جگـە لـە نەهێـشتنی دابونـەریتی کۆمەڵایـەتی و شێواندییەتی بۆ ئەوەی کولتووری نەتەوایەتی لەکەدار و ناشرین بکات.

## چوارەم: دەزگا ئایینییەکان :

ئـایین دیاردەیـەکی مرۆڤایـەتی گەردوونییـە هـیچ کـام لـە کۆمـەڵگاکانی لێ بێبـەش نەبووە، فەرهەنگی (لاروس)ی سەدەی بیستەم لەوە دواوە کـە بیروبـاوەڕی ئـایینی شـتێکی هاوبەشـە لـە نێـوان تێکـڕای مرۆڤـ و تەنانـەت مرۆڤـە بەراییـەکانیش لێـی بێبەری نەبوون و خاوەنی بیروڕا و باوەڕی ئایینی تایبەتی خۆیان بـوون، بایەخـدان بە واتای خواوەند و ئەو شتانەی کە لە پشت سرووشتەوەن یەکێکە لـە بیروبـاوەڕە جیهانییە زیندووەکان لەلای مرۆڤـ.

بەڵام بیروباوەڕی ئایینی خوویەکی دەروونی مرۆڤایەتییە، چونکە بەڵگە لە ئارادایـە و سرووشتی مرۆڤیش ئەم راستییە دەسەلمێنێ، بەم پێیەی ئایین جێگە و داڵدەی مرۆڤایەتییە لە کارەسات و ناخۆشیدا و قەڵایەکی پتەوە کە لە هەموو جۆرە خراپی و ناخۆشـــی و نەهامـــەتی و ئارەزوویـــەکی تایبـــەتی دەیپـــارێزێ. ســـەرەتا و کۆتاییەکەیشی لەوەدا کۆدەبێتەوە کـە ئـایین پێویـستییەکە و مرۆڤایـەتی ئێـستا و دوارۆژ ناچارێتی.







**ئایین چەند رووخسار و خاسیەتێکی تایبەتی هەیە کە دەتوانرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا دیاری بکرێن:**

١- ئایین کۆمەڵێك باوەڕ و بەهای پیرۆز و نەریت و رەوشت لەخۆ دەگرێت کە پەیوەندییەکی کاریگەرییان بە بوونەوەر و هێز و مەڵبەندە پیرۆزەکانەوە هەیە. لە رووی سرووشتییەوە لە هەموو ئەو شتانەش باڵاترە کە مرۆڤ بتوانێت دەستگیری بکات و بڕیاری لەسەر بدات.

٢- ئایین کاریگەریەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی قووڵی هەیە لە ناو دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدا کە باوەڕدارن دەستیشیان بەو شتانەوە گرتووە کە پەیوەندییان بە بەجێهێنانی ئەرکە ئایینەوە هەیە.

٣- ئایین رەوشتی مرۆڤ دیاری دەکات و نەخشەی ژیانی دەکێشێ و باری دەروونی پاك دەکات و کاروباری تایبەتی و گشتی رێکدەخات.

٤- ئایین دژ بە زۆرداری و کوێلەیەتی دەوەستێ و لە هەوڵیشدایە کە مرۆڤ بگەیەنێتە جیهانێکی بەختەوەری خۆشگوزەرانی و رێز و خۆشەویستی.

٥- ئایین وا لە باوەڕدار دەکات دەستی بە بەها پیرۆزەکانەوە بگرێت و بەردەوامیش باوەڕی بەو ئایینە هەبێت و لێی لانەدات.

٦- ئامانج و بەها ئایینییەکان بەلای کەسانی باوەڕدار بە چەند شتێکی پیرۆزی دروست دەژمێردرێت، جا لەبەر ئەو کارتێکردنەیە دەبێتە مایەی یەکێتی کۆمەڵ و پابەندیەتی بێ سنوورانە بە دابونەریتەکانی ئایین.

کەسێکیش کە باوەڕی بە ئایینەکەی هەبێ ناتوانێ بە راستی پەیڕەوی بکات گەر لە کۆمەڵگەدا گۆشەگیر بێ و تێکەڵی کەسانی تر نەبێت. بەم پێیە دەردەکەوێ کە تێکەڵاوی و گونجان چاکترین رێگەن بۆ تازەکردنەوەی باوەڕ و گشت بەها ئاسمانییەکان کە مرۆڤ باوەڕی پێیان هەیە، تێکەڵاویی و گونجانی بە کۆمەڵیش لە نێو مزگەوت و مەزارە ئایینییەکان و کڵێسە و شوێنگەکانی ئایینی پەیڕەو دەکرێت، چونکە لەم شوێنانەدا بیروهۆش و ویژدانی باوەڕداران یەك دەروون دەنوێنن و بە یەك بیروباوەڕ و بەها دەبەسترێتەوە، بەم چەشنە ئایین دەبێتە ئامرازێکی پشتگیریکردن و یەکێتی و پشتبەستن بەیەکبەستن لە نێوان تاکە کەسان و کۆمەڵان.

## ئامانجەکانی ئایین:

ئایین چوار ئامانجی بنەڕەتی بەدی دەهێنێت کە بریتین لە:

١- ڕوونکردنـــەوەی ئامـــانجی دەســـتە و چـــینەکان و شـــیکردنەوەیان لەگـــەڵ ئاشکراکردنی بناغە و هەموو ئەو شتانەی کە ڕایان گرتووە.

٢- نوێکردنەوە و گەشەپێدانی سۆز و هەستی هاوبەشی لە نێو تاکەکانی کۆمەڵگە لە ڕێگەی دابونەریتەوە دروست دەکات.

٣- دیاریکردن و چەسپاندنی سەرجەم ئەو بەها پیرۆزانەی کە خەڵك دەستبەرداری نابن.

٤- دیاریکردنی هۆی دابینکاری کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی پاداشتدانەوەی ئەوانەی ڕوو لە کاری چاك دەکەن و سزای ئەو کەسانەش دەدات کە ئاینیان کـاری خـراپ و ناپەسەند ئەنجام دەدەن.

## فەرمانە کۆمەڵایەتییەکانی ئایین:

ئایین چەند فرمانێکی کۆمەڵایەتی مەزن و پیرۆز بـۆ تاکـە کـەس و کۆمەڵگـە بـەجێ دەهێنێ، بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێیەتی هەرچەند کۆمەڵگە لە بواری زانـست و تەکنەلۆژیادا پێشکەوتوو بێت.

**چەند فرمانێکی کۆمەڵایەتی هەیە کە دەتوانرێت لەم خاڵانەدا کۆبکرێتەوە:**

١- پاڵپـشتی لـە ڕەوشـتی پەسـەند و چـاکەخوازی دەکـات و هۆیەکیـشە بـۆ پتەوبوونی یەکگرتنی کۆمەڵایەتی لە نێوان ڕۆڵەکانی یەك کۆمەڵگەدا.

٢- ڕوونکردنـەوەی دیاردەکـان و شـیکردنەوەی ئاڵۆزییـەکانی ژیـان، ئـەویش لـە ڕێگەی بەجێهێنانی کاروباری ئایینی کە دەبێتە هۆی ئارامی دەروونی مرۆڤ بـە تەواویش هەست بە توانا و غیرەت و کۆششی نەبڕاوەی مرۆڤ دەکرێت.

٣- ئایین بەهێزترین هۆی دابینکاریی کۆمەڵایەتییە، چونکە هەر ئایینە کە مرۆڤ لە کاروفرمانی خراپ و تووندتیژی دوور دەخاتەوە و هانیان دەدات بۆ کاروفرمانی چاکەخوازی و پەسەند کە ئەمیش ئەبێتە مایەی پێشکەوتنی کاروانی کۆمەڵگە لە گشت بوارەکاندا.

٤- ئایین ئاڵۆزی و هەڵچوونەکانی دەروونی مرۆڤ ڕێکدەخات و پاکییان دەکاتەوە لە کاتی کە گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەیەك بەرەو ڕوویان دێت دەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی ورە و توانای مرۆڤ .

٥- ئایین دەبێتە هاتنەکایەی کۆمەڵی بیروڕای گیانی و ڕەوشتی و بەهای سەرجەمیانە، ناوەڕۆکی ئەم بیروباوەڕییانە دەبێتە هۆی یەککگرتنی کۆمەڵگە و نزیکبوونەوە لە ئاژاوە و پەرتەوازەیی و بڵاوی و جیابوونەوە.

٦- ئایین ئەو پەیوەنییە مرۆڤایەتییانەی کە لە نێوان کەسانی کۆمەڵگەدا هەن پتەوتریان دەکات لە ڕێگەی ئامۆژگاری و پەیڕەوی و هاندان و نزیکبوونەوە لە کاری چاکە و دوورکەوتنەوە لە کردەوەی ناشیرین، بایەخیش دەدات بە ڕێزگرتنی کردەوەی باش و سزادانی ئەوانەی کە روو لە کاری خراپە دەکەن.

٧- ئایین لە بەهێزکردنی پایەی خێزان و زاڵبوونی بەسەر هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی رۆڵەکانیدا دەورێکی گرنگی هەیە، چونکە ئایین پاڵپشتی دەسەڵاتی باوك و دایك دەکات و هێزی کارتێکردنیشیان بەسەر رۆڵەکانیاندا زیاتر دەکات، گشت ئایینەکان بە تایبەتی ئایینی ئیسلام داوای ئەوە دەکات کە پێویستە رۆڵەکان گوێڕایەڵی باوك و دایکیان بکەن و پەیڕەوی فەرمان و ئامۆژگارییەکانیان بکەن.

## پێنجەم: دەزگا پەروەردەییەکان:

**دەزگای پەروەردەیی بریتییە لە:** (کۆمەڵێ یاسا و رێسا و فەلسەفەی دیاریکراو سەبارەت بە رەفتار و هەڵسوکەوتی و پەیوەندی پەروەردەیی کە لە رێکخراوە فێرکارییەکاندا هەن وەك باخچەی ساوایان و قوتابخانە و پەیمانگەو کۆلیژ و زانکۆکان).

جگە لەوەش بایەخ بە رێکخراوە پەروەردەییەکان و هۆیەکانی بوون و گەشەکردن و قۆناغە مێژووییەکانی گۆڕانیش دەدات کە پێیدا تێپەڕ بووە.

لێرەشدا کە لەم باسە دەکۆڵینەوە پێویستە ئەو فەلسەفە پەروەردەیی و مەبەستە بیردۆزی و زانستی و رێگا فێرکارییانەمان لەیاد نەچێت کە متمانەیان دەکرێتە سەر و ئەو بابەتانەش کە دەخوێندرێن و ئەو پەیوەندییانەی کە بە کۆمەڵگەوە دەیانبەستێ، تا چەند لەگەڵ ئامانجەکانی کۆمەڵگە و ئەو هەلومەرجە سەردەمیانە دەگونجێ کە پرۆسەی فێرکردن بەکاری دێنێ.



هەروەها سرووشتی ئەو پەیوەندییە پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییانەی کە مامۆستا و قوتابی بەیەك دەگەیەنێ.

ناتوانین بە تەواوی لە دەزگا پەروەردەییەکان تێبگەین ئەگەر تەنیا وەك لێکۆڵینەوەیەکی ئاسایی بەکارمان هێنا و جیامان کردەوە لە مرۆڤ و کۆمەڵگە، چونکە دەتوانین لە سرووشت بوونی و گرنگی و کاریگەرێتی ئەم دەزگایانە تێبگەین گەر بەسترا بە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسییەوە.

پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان دەزگا پەروەردەییەکان و کۆمەڵگەدا هەیە ، ئەمیش لە رێگەی دیاریکردنی ئەو ئەرك و فەرمان و بەرپرسیارانە کە کۆمەڵگە پێشکەشی دەزگا پەروەردەییەکان دەکات، دەتوانرێت لە ناوەرۆك و لایەنە پیشەییە کۆمەڵایەتییەکانی بکۆڵدرێتەوە و لێی تێبگەین، هەروەها دیاریکردنی ئەو ئەرك و فرمان و بەرپرسیارانە کە دەزگا پەروەردەییەکان پێشکەش بە کۆمەڵگەی دەکات.

**لەم خاڵانەی خوارەوەش چەند خزمەتگوزارییەك کە کۆمەڵگە پێشکەش بە دەزگا پەروەردەییەکانی دەکات دەخەینەڕوو:**

١- کۆمەڵگە کەسانی پیشەیی و هونەری و داهێنەر و بەتوانا دەخاتە دەزگا پەروەردەییەکان وەکو مامۆستا و کادیری بواری وانەبێژی و سەرپەرشتیاران بواری پەروەردە و فێرکردن.

٢- کۆمەڵگە لە رێگەی دەوڵەتەوە کە بە گەورەترین دەزگا هاوچەرخەکان دەژمێردرێت سەرپەرشتی پرۆگرامی ئەم دەزگا پەروەردەییانە دەکات و ئەو فەلسەفەیەش دەستنیشان دەکات کە پێویستە پەیرەو و پاڵپشتی بکرێن و بەدواداچوون بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە و بەرنامەکانی بکات.

٣- کۆمەڵگـە کەلوپـەل و پێداویـستییە مـاددی و نامادییـەکان بـۆ دەزگـا پەروەردەییەکان ئامادە دەکات.

٤- کۆمەڵگە لە ڕێگەی خێزانەوە قوتابیـان لـە قوتابخانەکانـدا نـاونووس دەکـات و چاودێری ڕەوتی وانە خوێندنیان دەکات و هانیان دەدا کە هەمیشە لـە چـوونە قوتابخانـەدا کەمتەرخـەمی نەکـەن و پارێزگـاری لـە کەلوپـەلی دەزگـا پەروەردەییەکان بکەن.

٥- کۆمەڵگە لە ڕێگەی دەوڵەتەوە ئەو ئایدیۆلۆژیا و بیروهزرانە دادەنێت کە دەزگا پەروەردەییەکان پەیڕەوی دەکەن ، چـونکە ئـەم دەزگایـە تـەواوکاری دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی دیکە دەبێت کە بونیادی کۆمەڵایەتی لێ پێکدێت.

## گرنگترین ئامانجەکانی دەزگا پەروەردەییەکان

١- پەروەردەیەکی بنەڕەتی و سەرەکی بە نەوەی نوێ بدرێ، کەبتوانێ بنووسێ و بخوێنێتەوە و لە کرداری ژمێریاری ئاگادار بێت و کەسێکی نەزان و دواکەوتووی لێ دەرنەچێ.

٢- شارەزایی وەربگرێـت لـە پەروەردەیـەکی ژیـاری کـە مێـشکی فـراوانتر بکـات و ئاسۆی بیری گەشتر و ڕۆشنبیری فراوانتر بێت.

٣- هـەوڵ دەدات تاکـەکان خـاوەنی کەسـایەتی خۆیـان بـن و بتـوانن لـە ژینگـەی خۆیاندا بسرەوون و بە باشی بحەوێنەوە.

٤- تێرو تەسەلکردنی کەسانی کۆمەڵگە بە شارەزایی و پسپۆڕی زانستی و ئەدەبی و هونەری کە کۆمەڵگەی نوێ پێویستییان پێی هەیە.

٥- راهێنان و مەشقپێکردنی کەسانی دەزگاکان لەسەر هەموو لایەنە پسپۆری و هونەرییەکان، دیارە ئەو کەسانەیەش پێویستە کە کۆمەڵگە متمانەیان پێ دەکەن بۆ راپەڕاندنی پلان و پرۆژەکان.

٦- چەسپاندنی گیانی چاکەخوازی و شارەزایی لەلای کەسانی کۆمەڵگە و بەرەنگاربوونەوەی کاری ناپەسەند لە رێگەی پەروەردە و فێرکردنەوە.

٧- رێکخراوە پەروەردەیی و فێرکارییەکان سەرچاوەی بنەڕەتی وەبەرهێنانی سامانی ئابوورین، چونکە هەر لە رێگەی ئەم دەزگایانەوە شارەزایی و توانای پسپۆری تاکەکانی کۆمەڵگە دروست دەبن و لەدواییدا دەتوانن بەکاربێنن بۆ بیناکردنی کۆمەڵگە و زیادکردنی بەرهەمداری و کارگوزاری.

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

پ١/ دەزگا کۆمەڵایەتییەکان چییە و جۆرەکانی چین و گرنگیان چییە؟

پ٢/ گرنگترین ئەو فرمانانە روون بکەرەوە کە خێزان پێشکەشی تاکە کەس و کۆمەڵی دەکات.

پ٣/ دەزگا ئابوورییەکان چییە و گرنگی بۆ کۆمەڵگە چییە؟ بە نموونە وەڵامەکەت روون بکەرەوە.

پ٤/ ئامانجە بنەڕەتییەکانی ڕێکخراوی رامیاری بژمێرە؟

پ٥/ قۆناغەکانی شیکردنەوەی دەزگا رامیارییەکان چین؟

پ٦/ گرنگترین ئەو فرمانانە کە دەوڵەت پێشکەشی هاووڵاتیانی دەکات بژمێرە؟

پ٧/ ئەو رووخسار و خەسڵەتانەی کە ئایین وەك سیستەمێکی گیانی کۆمەڵایەتی دەینوێنێ کامانەن؟

پ٨/ ئەو ئامانجانە چین کە ئایین بەدی دەهێنێت؟

پ٩/ گرنگترین ئەو فرمانانەی کە ئایین پێشکەشی کۆمەڵی دەکات بژمێرە؟

پ١٠- دەزگا پەروەردەییەکان چییە و ئەو خزمەتگوزاریانەش کە کۆمەڵگە پێشکەشی ئەم دەزگایەی دەکات چییە؟

پ١١/ گرنگترین ئامانجەکانی دەزگا پەروەردەییەکان بژمێرە؟

### چالاکی وانەی تایبەت:

(( لەلایەن مامۆستا و فێرخوازانەوە گفتوگۆ لەسەر یەکێك لەو دەزگا گرنگانە بکرێت))

# کێشە کۆمەڵایەتییەکان

## ١- پێناسەی کێشەی کۆمەڵایەتی:

کێشەی کۆمەڵایەتی (دیاردەیەکە هەڕەشە لە قەوارەی تاکە کەسان و کۆمەڵەکان دەکات، بۆیە پێویستە کاری هەرەوەزی ڕێکوپێك بۆ چارەسەرکردن و نەهێشتنی کۆسپ و تەگەرەکان ئەنجام بدرێت تا ئاکامە خراپەکانی وەك تاوان و تاوانکاری و خۆکوشتن و تەڵاقدان و ئالوودەبوون بە مەی خواردنەوە و بە مادە هۆشبەرەکان سەرهەڵنەدا و نەبنە هۆکارێك بۆ تێکدانی بەها جوان و چاکەکانی کۆمەڵگە).

**کێشەی کۆمەڵایەتی پێویستە دوو مەرجی هەبێت ئەوانیش بریتین لە:**

**یەکەم:** مەرجی (بابەتەکی)یان واقیعی واتە (پێویستە کێشەیەك لەناو کۆمەڵگە هەبێت وەك بوونی تاوان و هەژاری و ناکۆکی و ناتەبایی نێوان کۆمەڵانی جیاوان).

**دووەم:** مەرجی (خۆیەتی) واتە پێویستە کەسەکان هەست بە بوونی کێشەکە بکەن لە ناو کۆمەڵگەدا، بەو مانایەی مەرجی بابەتی کێشەیەکی راستەقینە بۆ کۆمەڵگە دێتەکایەوە دەبێ چارەسەری بکرێت.

بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پێویستە پێشوەختە کێشەکە دەستنیشان بکرێت و گەر بەو پەڕی ئاگایی و هۆشیارییەوە باری هەستەکی دیاری نەکرێت، ئەوا هەرگیز هەست بەو کێشەیە ناکرێت و بوون و نەبوونی وەك یەکە، بۆ نموونە لە کۆندا لە عێراق دەربەگایەتی باو بوو جووتیاری دەچەوساندەوە، کەچی جووتیاری بەدبەخت هەر ئەوەندەی دەزانی کە زەویوزار هی ئاغایە و مەسەلەکەشی مەسەلەیەکی تاکەکەسییەوە بۆی نییە بە تەنیا لە دژی ئاغاکەی بوەستێ و داوای مافی خۆی بکات. بەمجۆرە جووتیار بیری لە هۆی کێشەکە و سەرچاوەی سەرهەڵدانی نەدەکردەوە و ئەوەندە هۆشیار نەبووە تا بتوانێ بە شۆڕش باری

گـــوزەرانی کۆمەڵایـــەتی و رامیـــاری و ئـــابووری بگۆڕێـــت، کەواتـــە هۆشـــیاری و هەستکردن بـە گرفـت و کێشەکانی کۆمەڵگـە نـەبێت ئـەوا نـاتوانێ چارەسـەرێکی گونجاوی بۆ بدۆزرێتەوە.. سەبارەت بـە مـەی خواردنـەوەش مرۆڤـ یـان تاکـەکانی کۆمەڵگە بە هۆیەکان و زەرەر و زیانەکانی مەی خواردنەوە نازانن یـان هەوڵنـەدەن بەنەخشەکێشان و کـاری بێوچـانی کۆمەڵایـەتی ئـەو رەفتـارە لاببـەن و بـیر لـەوە ناکەنەوە کە ئەمەیان کارێکی ترسناکە ئەوا هەرگیز هەستێکی ئـەوتۆ بـە کێشەکە ناکـەن و بەرەبـەرە کێـشەکە پەرەدەسـێنێ و توندوتیـژی بڵاودەبێتـەوە. رادە و رێژەی بوونی کێشەکان لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر بەپێی شوێن و کات و پلەی شارستانێتی جیاوازە بۆ نموونە لە هەندێ کۆمەڵگەکانـدا لێـدانی منـداڵ بـە کێشە دەزانن و لە هەندێکی دیکە بە پێچەوانەوە، هـەروەهاش سـەبارەت بـە مـەی خواردنەوە لای هەندێ کۆمەڵگە ئاساییە و لای هەندێکی دیکە گەورەترین کێشەیە.

**رۆبـرت میرتـۆن ( Robert Merton ) کـە زانایـەکی ئەمەریکییـە دەڵێـت:**
کێشەی کۆمەڵایەتی (بۆشاییەکی گەورەی نێوان پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و واقیعـی کۆمەڵایەتی یاخود رەفتاری کۆمەڵایەتییە و کە ژمارەیەك لە تاکەکەسـانی کۆمەڵگـە بە بارێکی پەسەندی دانـانێن پێویـستە کـاری بێوچـان بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەنجام بدەن یـان هەنـدێکی دیکـە بڕوایـان وایـە کـە (کێـشەی کۆمەڵایـەتی بارێکـە لەگـەڵ بەهاکانی کەسانی نێو کۆمەڵگە ناگونجێ، ئەنجام تێکڕا لەوە حاڵی دەبن کـە دەبـێ کارێك بکرێ بارەکە بگۆڕدرێت).
کەواتە دەتوانین پێناسەیەکی سـەرەکی بـۆ کێـشەی کۆمەڵایـەتی ئـەنجام بـدەین و بڵێین:

**(کێشەی کۆمەڵایەتی بارێکە بە شێوەیەکی ناپەسەند کاردەکاتە سەر ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی و دەتوانرێ کارێك بە تێکڕای کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەرکردنی ئەنجام بدرێت).**

ئەم پێناسەیەش چوار رەگەز دەگرێتەوە:

١- بوونی بارودۆخ (بارێکە، واقیعێکە) کە هەلومەرج و کاریگەری زۆری لەسەر تاکە کەسان دەکات.

٢- بارودۆخ بە چەند رێگایەکی ناپەسەند کاری تێ دەکات.

٣- لەوانەیە تەنها رێگەیەك بەکار بێت بۆ چارەسەرکردنی حالەتەکە.

٤- لەوانەشە خەڵکی بە تێکڕا بە شێوەیەکی هاوبەشی چارەسەری کێشەکە دەکەن.

## ٢- هۆیەکانی کێشەی کۆمەڵایەتی:

کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر هۆکاری تێکەڵاوی هەیە لەوانە هۆکاری سەرەکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەرلەوەی باسی هۆکارە ڕاستەوخۆکانی کێشە بکەین، پێویستە ئاماژە بە لێکدانەوە سەرەکیە جیاوازەکان بکەین، کە بە هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەی کۆمەڵایەتی دەزانن و لێرەدا ئاماژە بۆ چەند لێکۆڵینەوەیەکی سەرەکی زانایان دەکەین، لەم لێکدانەوانەش:

أ- **لێکدانەوەی مێژوویی:** ئەمەشیان وای بۆ دەچێت کە کێشەکان لە ئەنجامی کەڵەکەبوون و تاقیکردنەوەی کۆمەڵایەتییەوە بە درێژایی مێژوو بەهۆی ئەو خراپەکارییەکی کە هاوشانی گۆڕانە کۆمەڵایەتی یاخود بارودۆخی و کارەساتی مێژوویی لەسەر یەکتری و کاریگەرییەکەی تا ماوەیەکی دوور و درێژ هەر دەمێنێتەوە.

ب- **لێکدانەوەی زیندەگی بایۆلۆژی:** ئەمە وای بۆ دەچێت کە کێشەکان لە ئەنجامی کەموکورتی بایۆلۆژی یان وەك پاشماوەیەك لە کۆمەڵگە ماونەتەوە بەجێ دەمێنێت و هەندێکیان بۆ کاری تاوانکاری و لادان هان دەدات.

## هۆکارە سەرەکییەکانی کێشە کۆمەڵایەتییەکان:

١- **لێکهەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتی:** واتە لاوازی لە پەیڕەوی دابینکاریی کۆمەڵایەتی و بێهێزی کاریگەری بەها و یاسا و لاوازبوونی دەزگاکان بەرامبەر بە دابینکاریی کار و رەفتاری تاکە کەسان و بەیەکەوە گونجانی نێوان پەیڕەو و دابونەریت و کۆمەڵ و کۆمەڵگەکانی ناوخۆ لەیەکتر دادەبڕێن و کاتێ کە دەسەڵاتداری دەزگاکان لاواز دەبێ ئەوا کەسان و رەفتاریان شێواو نارێك دەبێت، کرداری خراپ و نەشیاو ئەنجام دەدەن و پەیوەندی نێوانیان کز و لاواز دەبێت و بە تایبەتی لەکاتی تێکەڵاوبوونی کۆمەڵگە بە کۆمەڵگەیەکی دیکە و هاتنە ناوەوەی بەها و نەریتی نوێ کاریگەری راستەوخۆ دەکاتە سەر لێکهەڵوەشانەوەی کۆمەڵگە و تێکچوونی باری ئارامی ناو کۆمەڵگە، جگە لە کاریگەری ناهۆشیاری کۆمەڵایەتی کە کاریگەری راستەوخۆی لە سەرهەڵدانی هەندێ کێشەی کۆمەڵایەتییەوە هەیە.

٢- **گۆڕانی کۆمەڵایەتی:** گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بۆ کۆمەڵگە ئەرێی و بەکەڵکە، بەڵام هەندێك کێشە سەرهەڵدەدات کاتێ کە بەهاکانی کۆن رووبەڕووی بەهاکانی نوێ دەبنەوە ئەم بەیەکداچوونە جۆرە لەتبوونێکی کۆمەڵایەتی جێ دێڵێت لەوانەیە ململانێ لە نێوان نەوەی نوێ و نەوەی کۆن دروست بکات. هەروەها گۆڕانی کتوپڕ بە خێرایی ماددی و سستی هەنگاوەکانی لایەنی مەعنەوی لە بەرامبەریدا حاڵەتێك دروست دەکات و زانا (ئۆگبرن – OGBURN) بە پاشەکشێی شارستانیەتی ناوی دەبات.

بۆ نموونـه شۆڕشـی پیـشەسازی بـووە هـۆی پێـشکەوتنی لایـەنی مـاددی بـە هەنگاوی خێرا و تا وایلێهات زۆر لە ئافرەتان شانبەشـانی پیـاوان کەوتنـە کـار، ئەمــەش بــووە هــۆی جـۆرە گۆڕانکارییــەك لــە ژیــانی خێــزان و شــێرازەی پەیوەندییەکانی بووە هۆی گۆڕانی کۆمەلایەتی و راگوێزانی کۆمەڵگە لە بـارێکی دیاریکراوی کۆمەڵگە بۆ بارێکی نوێی کۆمەلایەتی کە پێویستی بە خۆگونجانـدن لەگـەڵ بـارودۆخی تـازەی ژیانیـان هـەبوو، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی (دواکـەوتنی شارسـتانێتی) و لێکهەڵوەشـانەوەی کۆمەڵگـە، چـونکە کـاتێ کـە لایــەنی کۆمەلایەتی ناتوانێ خۆی بە هەمان خێرای گۆڕانکـاری لایـەنی مـاددی بگۆڕێت ئەوا پاش دەکەوێت، لەبەرئەوەی لایەنی مادی زۆر بە پەلە و خێـرا روودەدات و کەچی لایەنی کۆمەلایەتی زۆر سست و لەسەرخۆ روودەدات.

### ٣- لێکهەڵوەشانەوەی خێزان:

خێزانی هەڵوەشاوە یا هەندێ جار پێی دەگوترێ ماڵی وێران بریتییە لەو خێزانەی کە وابەستەی کۆمەلایەتیان نەماوە واتە نەمان یـان کزبـوونی پەیوەنـدی نێـوان ئەندامـــەکانی خێـــزان و پەرتـــەوازەبوونیان جـــا چ بەهۆی جیابوونەوەی دایك و باوکان یان مردنی یـەکێکیان بێت، ئەوا خێزان لەبەر یـەك هەڵدەوەشێتەوە و لەت لەت دەبێـــت، ئەمـــەش ئـــەوە ناگەیـــەنێ، کـــە هـــەموو حاڵەتێکی جودابوونەوە یـان



مردن دەبێتە هۆی تێکدانی خێزان، جاری وایش هەیە باوک یان دایک مافەکانی خێزان پێشێل دەکەن و بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵناستن و هەر خەریکی قومار و مەی خواردنەوە یان کاری بەدرەوشتی ناشایستە دەبن و خێزانەکەیان لە نێو کۆمەڵ کێشە نقووم دەکەن و دەسەڵات لەماڵدا مایەپووچ دەبێت و هەریەکە لە ئەندامان بەلایەکدا دەچێت و تووشی بەرەڵایی و لە ڕێ لادان دەبنەوە.

### ٤- کۆچکردن:

کۆچکردن یەکێکە لەو کێشە سەرەکییانەی زۆربەی کۆمەڵگە جۆربەجۆرەکان بە تایبەتی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتی و گەشەکردووەکان بە دەستییەوە دەناڵێنن و دەبێتە سەرچاوەیەکی زۆری کێشەکان، چونکە ئەوانەی کۆچ دەکەن بە ئاسانی لەگەڵ بار و ژیانی نوێ و دابونەریت و بەهاکانی کۆمەڵەکە واتە ئەو کۆمەڵگەیەی کە کۆچیان بۆ کردووە ناگونجێن، یان پەناهەندەکان دووچاری جێگای ناخۆش و کەمیی ئاو و نەبوونی کارەبا و خراپی باری تەندروستی یان هۆیەکانی گەیاندن و باری گوزەرانی شڵەژاو دەبنەوە.



### ٥- بێتوانایی هەندێ لە دەزگاکان:

بونیادی کۆمەڵگە لە دەزگاکانی پەروەردە و ئابووری و تەندروستی و چەندین دەزگای دیکە پێکدێت، هەر دەزگایەك بە خزمەتگوزاری تایبەت هەڵدەستێ و لە میانیانەوە خزمەتی کۆمەڵ دەکات و هەر کەموکورتییەك لە خزمەتگوزاریی و پێداویستییەکانی کۆمەڵ کێشە دروست دەکات. وەکو نەبوونی کارەبا و خراپی ڕێگاوبان و نەبوونی ئاوەڕۆ و کەمی ئاو و نزمی باری گوزەران و زۆری قوتابی و کەمی قوتابخانە و چەندین کەموکورتی دیکە.

### ٦- بەیەکدادانی بەهاکان:

بەهاو ڕێساکانی رەفتارکردن ڕێکخەری مامەڵە و کارتێکردنی نێوان خەڵکین و خەڵکی لە لەڕێدەرچوون و لادان دەپارێزن، بەلام هەندێ بەهای نوێ سەرهەڵدەدەن دەبێتەهۆی گۆڕانی کۆمەلایەتی، چونکە بەها کۆنەکان پێداویستییەکانی خەڵك و نوێکاری ژیان دابین ناکات یاخود بەهۆی کاریگەریە شارستانیەتی کۆمەڵگەی دیکە، یاخود و بەهۆی کۆچکردنیش یان کارتێکردنی شارستانییەتی کۆمەلانی دیکە ئەوا بەهای نوێ سەرهەڵدەدا و بەها کۆنەکان و هی نوێکان ناتەبا و نارێك دەبن و ناتەبابییەکەش هاودژیەتی لە رەفتار و هەڵوێست و خوو و رەوشت و گوێڕایەڵی و راستی دابونەریتە کۆمەلایەتییەکانی دیکەش دەگرێتەوە کە لە ئەنجامدا رەفتاری هاودژ و جۆرەها ناتەبایی کۆمەلایەتی دێتە کایەوە، زۆر جاران بە (پێکدادانی شارستانیەتی) دەناسرێت. واتە جیاوازی شارستانیەتی کۆمەڵگەیەك لەگەڵ شارستانیەتی کۆمەڵگەیەکی دیکە لە یەکتر جیاواز و ناگونجاوە.

### ٧- جیاوازی نێوان واقیع و خواستی تاکەکان:

لەوانەیە کەسەکان پێویستیان بە جۆرە ئاستێکی بەرزی گوزەران هەبێت بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانیان، کەچی ئەم ئاستە لەبەر هەندێ بارودۆخی کەمدەرامەتی و کەمی داهات بۆیان نالوێ، یان پێداویستی ژیان پێویستی بە بارێکی دارایی رەهایە و کەسەکان ناتوانن پێی رابگەن، بۆیە هەندێ لەوانەی بە باری نالەباری پەروەردەیی کۆمەڵایەتی تێدەپەڕن لاواز دەبن و رێگەی نایاسایی و نەشیاو دەگرنەبەر بۆ وەدەستهێنانی نیاز و خواستەکانیان کاری گەندەڵی دەکەن بە رێباز وەك هەوڵدان بۆ دەسکەوتنی سامانی زۆر و دەوڵەمەند بوون، ئەویش لە رێگەی دزی و فرتوفێل و بازرگانیکردن بە مادەی خراپ و هۆشبەر و تێکدانی باری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە.

## ٣- رۆڵی کۆمەڵناسی لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان:

کۆمەڵناسی بە شێوەیەکی زانستی و واقیعیانە دەڕوانێتە کێشەکان و بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی لێکۆڵینەوەی لە قەڵەم داوە و ئەوەی سەلماندووە کە دەبێت هۆکاری کێشەکان و چۆنیەتی چارەسەرکردنی بە شێوەیەکی زانیارییانە دیاری بکرێن.

**رۆڵی کۆمەڵناسی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵایەتی بەم چەند هەنگاوە دەبێت:**

١- دەست نیشانکردنی سرووشت و سنووری کێشەکە و رادەی بڵاوبوونەوەی.

٢- زانینی هۆکارە جۆراجۆرەکانی کێشەکە.

٣- دەبێ ئەوە رەچاو بکرێ کە کێشەی کۆمەڵایەتی زیاتر لە یەك هۆکارێکی هەیە و هەر هۆکارێکیش هێزی کاریگەری لە هۆیەکەی دیکە زیاترە.

٤- نابێ کێشەی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی تێکڕای کۆمەڵگە دابڕێت، چونکە کێشەکە بەشێکە لە واقیعی کۆمەڵایەتی و هەر کەموکورتییەکی ئەم بونیادە یان گۆڕانکارییەکانی سەری و کار دەکاتە سەر چۆنیەتی چارەسەرکردنەکە.

٥- بەکارهێنانی شێوازی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی کە خۆی لە چاوپێکەوتن و پرسیارکردن لە خەڵکی سەبارەت بە کێشەکە دەنوێنێ.

٦- توێژەر پاش لێکۆڵینەوەی لە کێشەکە و سرووشت و هۆیەکانی ئامۆژگاری و پێشنیارەکانی دەخاتە بەردەم لێپرسراوانی، ئەوانیش بە ڕێبازی تایبەتی خۆیان چارەسەری دەکەن.

**کۆمەڵناسی بە هەموو لقەکانیەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەدات و بایەخی بەم بوارانە داوە:**

**أ- بواری تاوانکاری:**

تاوانزانی هەنگاوی فراوانی بەرەوپێشچوونی بەخۆوە بینیوە و توانیویەتی لە ڕەفتاری تاوانکار و سرووشتی تاوانکاری بگات و چۆن چارەسەری بکات، جگە لە دانانی ڕێبازێك بۆ گەڕاندنەوەی تاوانباران بۆ سەر ڕێی ڕاست (واتە چۆن تاوانبارێك لە دەزگای چاکسازیدا) والێبکات کە ببێتە مرۆڤێکی ئاسایی و بگەڕێتەوە نێو کۆمەڵ).

**ب- بواری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی:**

بریتیە لە لێکۆڵینەوە لە کێشەی ناوچە جیاجیاکان و کێشەکانی لاوان و خێزان و کۆمەڵ و کەسانی بەتەمەن دەکۆڵێتەوە و پێشنیاری و ڕێنمایی بۆ چارەکردنیان دەکات، تا کەسەکان لە کۆمەڵدا ببنە تەواوکار و ڕۆڵی خۆیان لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا ببینن.

### ج- بواری لادێییەکان:

ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی بریتیە لە یەکێکە لـە پـسپۆڕایەتی کۆمەڵایـەتی کـە گرنگی و بایەخ بە لێکۆڵینەوەی کۆمـەڵانی لادێ دەدات و لـە کێـشەکانی لادێ و کێـشەی بـەرووبوومیان دەکۆڵێتــەوە و جگــە لــە چـۆنێتی چارەســەرکردنی کێشەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتوانی دێهاتەکان دەکۆڵێتەوە.

**د- کۆمەڵناسی لە هەندێ بواری دیکەی** وەك کێشەکانی چالاکی پیشەسازی وەکو کێشەی کرێکاران و نیشتەجێکردن و کێشەکانی پەروەردەیی دەکۆڵێتەوە.

## گرنگترین کێشە کۆمەلایەتییەکان و رێگاکانی چارەسەرکردنیان:

لـە سەرانـسەری جیهانـدا کۆمەڵگـە جیاوازەکـان رووبـەڕووی چـەندین کێـشە و گیروگرفت دەبنەوە وەك کێشەکانی منداڵ و لەتبوونی خێزان و کێـشەی لاوان و پـیران و کێـشەی کۆچـکردن و بێکـاری و مـەی خواردنـەوە و تلیـاك کێـشان و خۆکوشتن و دەربەدەربوون و تاوانکـاری، جگـە لـە کێـشەکانی سرووشـتی وەك زەمینلەرزە و لافاو وشکەساڵی لەبەر کەمی باران، بەڵام لێرەدا چەند کێـشەیەك دەخەینەڕوو.

### یەکەم: تاوانکاری

تاوان دەستدرێژییە بۆ سەر یاسا و سەرپێچیکردنە لـە مافـەکانی تـاك و کۆمەڵگـە، یاسا سزا بۆ تاوانکاران دەبڕێتەوە، تاوانیش زۆر جۆری هەیە لەوانە:

١- **تاوانی کوشتن:** یەکێکە لـەو تاوانـە گەورانـەی کـە دەرحـەق بـە کەسـێك یـان کۆمەڵێ خەڵك ئەنجام دەدرێت.

٢- **تاوانی دارایی:** (دزین و گەندەڵی و رفاندن و ساختەکاری لە دراو و تاوانەکانی بازاڕی ڕەش کە بە تاوانی ئابووری لە قەڵەم دەدرێن و هەندێجار لـەم تاوانانـەدا

کاری توندڕەویش دەکرێت وەك دزین  و ڕێگرتن و لێدان و شکاندنی دەرگا و پەنجەرە و سووتاندنی دوکانەکان بۆ ئەنجامدانی خراپەکاری.

٣- **تاوانی جنسی (سێکسی):** ئەو جۆرە تاوانە واتە دەستدرێژیکردنە سەر ڕەگەزی مرۆڤ و پێشێلکردنی مافە تایبەتییەکانی تاکە کەسەکان. هەندێ جار بە رفاندن و زۆرلێکردن ئەنجام دەدرێت و ئەویش دوو جۆرن:

أ- **تاوانی تاکەکەسی:** کە تەنها کەسێك دەستدرێژی دەکاتە سەر ڕەگەزی مێینە یان هاوڕەگەزی خۆی و، بەها ڕەوشتەکانی کەسێکی دیکە لەکەدار دەکات.

ب- **تاوانی ڕێك:** کۆمەڵێك، یان دەستەیەك پێی هەڵدەستن و هەریەك لە بەشداربووان لە کاری تاوانەکە ڕۆڵێکی تایبەتیان هەیە و هەموویان لەسەر شێوازە جێبەجێکردنەکەی ڕێك کەوتوونە و ئەمانیش ڕێبازی تایبەتیان لە تاوانکاری پەیڕەو دەکەن.

## هۆکار و چارەسەرییەکانی تاوانکاری:

تاوانی زۆر و جۆربەجۆر لە کۆمەڵگەی جیهانەوە بڵاوبۆتەوە وەکو کێشەی منداڵ و لێك هەڵوەشانەوەی خێزان و کۆچ کردن و ئالودەبوون بە مەی و مادە هۆشبەرەکان و خۆکوشتن و پەرتەوازەیی و تاوانکاری

١- بێکاری یەکێکە لە هۆیە گرنگەکان کە تاکەکەس بەرەو تاوان پەلکێش دەکات، چونکە نەبوونی کارو کردەوەیەك کە خۆیانی پێوە خەریك بکەن وا دەکات تاکەکان کاتی دەستبەتاڵیان زۆر بێت و باری ئابووریان خراپ بێ، بۆیە دەبێت دەرفەت بۆ کارکردن ساز بکرێت.

٢- ڕێبازی جۆراوجۆر بۆ بەفێرۆنەدانی کاتی لاوان دابینبکرێت وەك یانە و پەرتووکخانە، ڕێکخستنی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی و رادیۆ و پێشکەشکردنی بەرنامەی بەسوود.

٣- دابینکردنی پاسەوانانی چاك بۆ پاراستنی دوكان و ماڵ و موڵكی خەڵكی لە دزین و دانانی پاسەوانی تایبەتی سەرەڕێ تا دەرفەت بە نیاز و خواستی دزین و دەستدرێژییکاری سەر ماڵ و ژیانی خەڵكی نەدرێت.

٤- بایەخدان بە رێبازی (چاككردنەوەی تاوانباران) واتە پەیرەوكردنی رێبازی چاكەسازی لە بەندیخانەكاندا بەو شێوەیەی كە تاوانبار فێر بكرێت و رەفتاری خۆی چاك بكات و بەشێوەیەك رابهێنرێ تا ببێتە مرۆڤێكی بە سوود و بە كەڵك بۆ كۆمەڵگە بۆ كۆمەڵگەكەی، دەبێ فێری جۆرە پیشەیەك بكرێ تا لە دەرەوەی بەندیخانە كار بكات و رەنجی ماندووبوونی خۆی بخوات و كەس ئەشكەنجە و ئازار نەدات و پەنا نەباتە بەر دزی و جەردەیی.

## دووەم : هەڵوەشانەوەی خێزان :

مەبەست لە هەڵوەشانەوەی خێزان تێكچوونی پەیوەندییەكانی نێوان ئەندامانی خێزانە ئەویش بەهۆی مردنی دایك و باوك یان جیابوونەوەیان بەهۆی گیران، یان بەدیل گرتنی باوك و هەندێجار بەهۆی ستەمی دایك و باوكان یان ناتەبایی و ناكۆكی نێوانیان، لە ئەنجامدا ناخۆشی باڵی رەشی دەكێشێتە سەر خێزان و منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی بێبەش دەبێ و خۆراك و خواردەمەنی و جلوبەرگی دەست ناكەوێ و ناچار لە سنووری دەرەوەی خێزان بە دوای پێداویستییەكانی دەگەڕێت، ئەمەشیان بۆی دەبێتە سەرەتای بەرەڵابوونی و پەرتەوازە بوونی ئەندامانی خێزانەكە.

## چارەسەرکردن:

١- دەبێ بەر لە پرۆسەی هاوسەگیری مرۆڤ لەو کەسە تێبگات کە دەیەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجام بدات و لەسەر بناغەیەکی راست و دروست پەیوەندییەکە ببەسترێ بەوەی دەبێ ئاستی ئابووری و رۆشنبیری و تەمەن و بیروبۆچۆنیان لەیەك نزیك بێت.

٢- نابێ مارەیی ئەوەندە زۆر بێ و ژنهێنانەکە پارەیەکی زۆری تێبچێ و ژن و مێرد قەرزار ببن و ژیانیان لێ تاڵ ببێت تا ماوەیەکی زۆر هەر خەریکی قەرزدانەوە بن.

٣- دابینکردنی شوێنێك بۆ ژیان و گوزەرانیان (شوێنی نیشتەجێبوون) واتە خانوویێك بۆ حەوانەوەیان کە ئەمە ئەرکی دەوڵەتە شوێنی حەوانەوە بۆ هاوولاتیانی دەستەبەر بکات.

٤- دابینکردنی دەرفەتی کارکردن بۆ تاکەکان لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی داهاتیان و خۆشگوزەرانی ئەندامانی.

٥- پێویستە دامودەزگاکانی خزمەتگوزاری دیکە بە رۆڵی هاریکاری لەگەڵ خێزان هەڵبستن تا ئەرکی سەرشانیان کەم بکەنەوە ئەم دەزگایانەش وەك:

أ- قوتابخانە: دەبێ لە کێشەکانی قوتابیان و پەیوەندییەکانیان بە خێزان بکۆڵێتەوە.

ب- وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی دەبێ لە باری خێزانانی لێکهەڵوەشاوە بکۆڵێتەوە و چارەسەری کێشەکانی لە رێگای توێژەرەکانەوە بکات.

ج- باخچەی منداڵان دەبێ بە رۆڵی تایبەتی خۆیان هەڵبستن و منداڵان بەویەڕی سۆزەوە پەروەردە بکەن.

د- دەبێ رێکخراوەکانی ئافرەتان و ژنان رۆڵیان لە رۆشنبیرکردنی خێزان هەبێت و کێشەکانیان چارەسەر بکات و رۆڵیان هەبێت لەرۆشنبیرکردنی ئافرەت و ژنان.

## سێیەم : کۆچکردن:

کۆچکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و لەناو زۆربەی کۆمەڵگەکان بەرچاو دەکەوێ، بەڵام لە کۆمەڵگەی رۆژهەڵات و دواکەوتوودا زیاتر بەرچاو دەکەوێت، کۆمەڵان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە کۆچ دەکەن و کۆچیش دوو جۆرە:.

١- **کۆچی ناوخۆ**: ئەمەیان کۆچی ناوخۆی ناو دەوڵەت و کۆمەڵگەیە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگرێتەوە واتە لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە، یاخود لە گوندەوە بۆناو شار یان لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی دیکە لە سنووری یەك دەوڵەت تێناپەڕێت.

٢- **کۆچی دەرەوە**: ئەمجۆرە کۆچکردنە لە نێو کۆمەڵگە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤایەتی لە کۆنەوە هەیە و بۆتە دیاردەیەکی جیهانی. بریتییە لە کۆچکردن بۆ دەرەوەی سنووری کۆمەڵگە و وڵات واتە بۆ وڵات و کۆمەڵگەیەکی دیکەیە.

### کۆچکردنی ناوەخۆ چەند هۆکارێکی هەیە:

١- باری گوزەرانی خراپ لە گوند و دێهاتەکان و سیستەمی دەرەبەگایەتی زۆردار و ئەشکەنجە و ئازاردانی جووتیار و کرێکاران، جگەلە کەمی دەرفەتی کارکردن لە گوندەکان و زۆری کار لە شارەکان و خزمەتگوزاری باش وەك شەقامی پان و بەرین و قیرتاو کراو و قوتابخانە و نەخۆشخانەکان.. ئەمانە هەموو هۆی هاندەری کۆچکردنن.

٢- کارەساتە سرووشتییەکان وەك لافاو و بومەلەرزە و نەهاتی بەهۆی کەمی باران کەمی ئاو و نەبوونی کارەبا دەبنە هۆی کۆچکردنی کتوپڕ لە گوندەوە بۆ شار.

٣- زۆر لە جووتیاران گوند جێ دێڵن وکۆچ بۆ لای کەسوکاریان لە شارەکان دەکەن.

## کاریگەری کۆچی ناوخۆ:

١- کۆچکردن بۆ شار دەبێتە مایەی کەمی بەروبوومی کشتوکاڵ لە دێهاتەکان و کەمی داهاتی نەتەوەیی.

٢- ئەوانەی کۆچ بۆ شار دەکەن دووچاری تەنگ و چەڵەمەی جۆراوجۆر دەبن وەك جێگای خراپ لەبەر گرانی کرێی خانوو و نەبوونی ئاو و کارەبا لەو شوێنەخراپانەی کە تیایدا جێگیر دەبن.

٣- دووچاری بارێکی دەروونی خراپ دەبنەوە، بەهۆی سەختی گونجانیان لەگەڵ کۆمەڵی نێو شار بەهۆی ئەو بەها و دابونەریتانەی هەیانە لەگەڵ شار لە یەك ناچن دەبێتە مایەی نارەحەتییان.

٤- دانیشتوانی ناو شارەکان روو لە زۆر بوون دەکات و جۆرە پاڵەپەستۆیەکی دانیشتوان روو دەدات و دەبێتە هۆی کەمی خزمەتگوزاری و خانووبەرە بۆ نیشتەجێ بوون و کەمی شێوازەکانی گەیاندن تەنانەت وزەی کارەبا و ئاویش لە کورتی دەدات.

## چارەسەرکردن :

١- چاککردنی زەویوزاری کشتوکاڵی و دابەشکردنی بەسەر جووتیاران و دابینکرنی ئاوی ئاودێری و گرنگیدان بە بەرهەمی ناوەخۆیی.

٢- دەستەبەرکردنی تۆ و پەینی کیمیاوی و ئامێری جووت و چاندن بۆ جووتیاران، سەرباری قەرزپێدانیان بۆ گەشەپێدانی بەرهەمی کشتوکاڵی.

٣- دابینکردنی خزمەتگوزاری چاك بۆ دێهاتەکان وەك ئاو و کارەبا و قوتابخانە و نەخۆشخانە و گەیاندن و چاککردنی رێگاوبان.

٤- دامەزراندنی پیشەسازیی تایبەت بە بەروبوومی کشتوکاڵی لە گوندەکان، جگە لە پیشەسازیی دەستکرد بۆ خەڵکی گوندەکان.

## هۆیەکانی کۆچکردنی دەرەکی:

١- خراپی باری ئابووری کۆمەڵگە و کەمی دەرامەت و خراپی گوزەران.



٢- نائارامی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە، بەتایبەتی لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان بۆ خۆرزگارکردنی لە بارودۆخی نائارامی و پەشێویی.

٣- چاولێکەری و لاساییکردنەوە، هەندێ کەس لاسایی خەڵکی دیکە دەکەنەوە بۆ کۆچکردن وەکو چاولێکەری دراوسێ یان برا یان خزم و کەسوکار.

٤- بۆ مەبەستی خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەرزتر.

## چارەسەرکردنی کۆچکردنی دەرەکی:

١- هەوڵدان بۆ دابینکردنی کار و دەرفەتی کارکردن بۆ لاوان.

٢- دابینکردنی خانوو و شوقە بۆ ئەو لاوانەی لە نوێ هاوسەرگیری دەکەن.

٣- پێدانی پێشینەی هاوسەرگیری بە رێژەیەکی گونجاو و لێ خۆشبوونیان لەلایەن حکوومەتەوە.

٤- گرنگیدان بە توانا و بەهرەکانی کەسانی بە توانا و داهێنەر.

٥- دامەزراندنی تاکەکان لە دامودەزگا میرییەکان بەپێی پسپۆڕییان و بە مووچەیەکی شیاو کە لەگەڵ بارودۆخی ژیانی بگونجێ بەبێ جیاوازیکردن.

## چوارەم : کێشەکانی منداڵ





زۆربـــەی زۆری وڵاتـــانی جیهـــان دووچـــاری کێـشەکانی منداڵان دەبنەوە و لە هەموو کێشەکان گرنگتر کێشەی کەمی خۆراك و کەمی دەرمان و بڵاوبوونەوەی نەخۆشـی کوشندەیە، بـە تایبـەتی ئـەو نەخۆشییانەی کـە دەبنـە هۆی کەمهۆشی منداڵان و دواکەوتنی نەشـونمایان وەکـو ئێسکە نەرمـە و تالاسیما، جگـە لـەو کێشانەی کـە لـە ئـــەنجامی هـــەژاری وهەڵوەشـــاندنەوەی خێـــزان وەك بەرەڵابوون ، وا رێکدەکەوێت هەندێ لـە دایکـان بـەهۆی بـاری ژیانیانـەوە کاردەکـەن و لـە پـەروەردەی منـداڵ کەمتەرخـەم دەبـن و سـۆز و خۆشەویـستی بـە منـداڵ نابەخشن. یاخود بـە هەڵـە پـەروەردەیان دەکـەن وەکـو بــەکارهێنانی توندوتیــژی ولێــدان و قــسەی ناشــیرین، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر باری دەروونیان هەیە.

## چارەسەرکردن :

کێشەکانی منداڵان کێشەیەکی ئاسان و ساکار نین، چونکە ساڵانی منداڵیەتی تیایدا ناســنامەی مرۆڤــ دەچەســپێنێت و گــەر منــداڵ ســەبارەت بــەباری کۆمەڵایــەتی وتەندروستی چاك پەروەردە بکرێت، ئەوا بە هۆشمەندی و ساغ و سەلامەتی لەش و مێشك گەشە دەکات و دەبێتە ئەندامێکی سوودبەخش و چاکی کۆمـەڵ، ئـەگینا بـە پێچەوانەوە مرۆڤێکی کەم عـەقل و لـەش نەخۆشـی لـێ هەڵدەکـەوێت و لەوانەشـە ببێتە مایەی ئەشکەنجە و ئازاردانی خەڵك و کۆمەڵەکەی، کەواتە کۆمـەڵ پێویـستی بە گەلێکی خاوەن لەشی بەهێز و هۆشمەند و هۆشیار هەیە.





بۆیەش دەبێ کێشەکانی منداڵان چارەسەری بکرێت و ئەم چەند رێگایەش بۆ چارەسەرکردنی پەیرەو دەکرێت:

١- دەبێ خێزان چاودێری منداڵەکانی بکات و خواردن و خواردنەوەی چاك و رێگەی پەروەردەی باشیان بۆ دابین بکەن و ئاگاداری باری تەندروستییان بن.

٢- دابینکردنی دەرمانی پێویست و چارەسەرکردنیان لە دەزگاکانی تەندروستی وەك نەخۆشخانە و دەزگاکانی دیکەو کوتانی منداڵان دژ بە هەموو نەخۆشییەکان.

٣- ئامادەکردنی خۆراکی باش بۆ منداڵان وەك شیر و سەوزە و میوە و ئەو مادانەی پرۆتینیان تێدایە.

٤- دامەزراندنی باخچەی منداڵان تا هاریکاری دایکان بکەن لە کاری پەروەردەکردن و فێری شتەکانی بەر لە قوتابخانە بکرێن.

٥- دەبێ پەروەردەکردن لەقوتابخانە بەپێی نەخشەیەکی دیاریکراو بێ و بایەخ بە لایەنی ژیریایەتی و پەروەردە و بونیادی لەش و شێوازی توندوتیژی لە پەروەردە بدات.

## پێنجەم: هەرزەکاری و کێشەکانی :

هەرزەکاری یەکێکە لە قۆناغە زۆر هەستیارەکانی تەمـەنی مرۆڤـ کـە دوای تەمـەنی منداڵی دەست پێ دەکات، چەندین گۆڕانی جەستەیی و دەروونـی لـە ژیـانی مرۆڤـ روودەدەن، بەپێی بیروڕای کۆمەڵناسان تەمەنێکی دیاریکراو نییـە بـۆ هـەرزەکاری، بەلام بە شێوەیەکی گشتی هەر لە تەمەنی (٩) ساڵییەوە دەستپێدەکات تا تەمـەنی (١٦) ساڵی، بەلام هەندێ بیرمەنـدان بیروڕایـان وایـە کـە لـە تەمـەنی ١٢ سـاڵییەوە دەستپێدەکات تاوەکو تەمەنی ١٨ ساڵی، بەلام مەرج نییە ئـەم تەمەنـە بـۆ هـەموو تـاك و هـەموو کۆمەڵگەیـەك شـیاو بێـت پێـوەرێکی سەداسـەد بێـت، چـونکە چەندین هۆکاری جۆربـەجۆر کاریگـەرییان لەسـەر پێگەیـشتن و گەشـەکردنی باری دەروونـی و جەسـتەیی مرۆڤـ هەیـە، وەکـو پلـەی گـەرمی و بـاری ژینگـەی خێـزان و کۆمەڵگـە، لـە شـوێنە گەرمـەکان کـچ لـە



تەمـەنی ٩ سـاڵی هـەرزەکاری دەسـتپێدەکات، بـەلام لـە ناوچـە سـاردەکان لـە تەمەنێکی درەنگتر گەشە دەکات.

## تایبەتمەندییەکانی هەرزەکاری :

ئەم تەمەنە چەندین تایبەتمەندی خۆی هەیە وەکو گۆڕان و گەشەکردنی باری جەستەیی و لەشولار و دەنگ و گۆڕان لە ئەندامانی سێکسی. مرۆڤ لەم قۆناغەدا ڕاڕا و پەشۆکاو و لەبارێکی دەروونی ناجێگیر دەژی، ئەویش بەهۆی ئەو گۆڕانەی کە بەسەر ژیانی دادێت، سەرەڕۆ و هەوڵی لادان لە بەها و دابە کۆمەڵایەتییەکان دەدات و دژایەتی نەریتە باوەکانی کۆمەڵگە دەکات و لەگەڵ کەسانی دەوروبەری دەکەوێتە کێبڕکێ و ناڕەزایی دەربڕین، حەز بەدەرچوون لە پێوەرە گشتییەکانی کۆمەڵگە دەکات.

## پێداویستی ئەم قۆناغە :

ئەم قۆناغە پێویستی بە ڕێنمایی و ئامۆژگاری لەسەرخۆی دایك و باوکان هەیە و چاودێری هەڵسوکەوتی تاکەکان بکرێ و هەوڵبدرێ هاورێ وبرادەرەکانی بزانرێ و ڕۆژانە ئاگاداری کار وکردەوە و هەڵسوکەوتەکانی بکرێ، چی دەکا و هاوڕێکانی کێن؟.

باوك و دایك ببنە دوو هاوڕێی نزیکی منداڵەکانیان، چونکە بەمجۆرە دەتوانرێ متمانە لەلای یەکتر دروست بکەن وکێشە و گرفتەکانی منداڵەکانیان بزانن، دووریان بخەنەوە لە کاری خراپە و ڕەفتاری ناڕێك و نەشیاو، بەمەش منداڵەکانیان بە پەروەردەیەکی باش و زانستیانە پەروەردە بکەن... شتە شاراوە و نهێنییەکان بۆ یەکتر باس بکەن و لە یەکتر تێبگەن.

## شەشەم : ئالوودەبوون بە مەی و مادە هۆشبەرەکان ( الادمان على المخدرات ):



ئــالوودە بـــوون واتـــە (ڕاهـــاتن لەســـەر ڕەفتارێکی دیاریکراو، کـە تـاك ناتوانـێ بـە ئاسـانی وازی لێ بێنـێ). ئـالوودەبوون بـە مـادە هۆشـبەرەکان یەکێکـە لـەو کێشە بەربڵاوانەی ئەمڕۆی جیهان بایـەخێکی زۆری پێدراوە.

### جۆرەکانی ئالوودەبوون :

#### ١- ئالوودەبوونی هەمیشەیی:

وەکو ئالوودەبوون بە مادە هۆشبەرەکان کە مەترسیدارترین کێشەیە و زۆربـەی کۆمەڵگەی جیهان ڕووبەڕووی بوونەتەوە، لـە ئـەنجامی ئـەم خـووە کارەسـاتێکی گـــەورە بەســـەر کـــەس و خێـــزان و کۆمەڵگـــە دێنێـــت. کەســـی ئالوودە بوو تەندروستییەکەی بەرەو خراپی دەچێ و ڕەفتاری شڵەژا و نـاڕەوا دەبـێ و خـەڵك ڕەخنـەی زۆری لێ دەگرن و ناتـەبایی ئەنـدامانی خێزانـی دەگرێتـەوە و نـاکۆکی دەکەوێتـە نێـوان ژن و مێردەکـەی و کەسـی سـەرخۆش دەسـەڵاتی بەسـەر ژن و خێزانەکەی نامێنێ، هەندێ جار سەرخۆشان تـاوان و دزی دەکـەن و تەنانـەت لـە کوشتنیش درێغی ناکەن. لە هەموو ڕەوشـت و ڕەفتـارێکی مرۆڤایـەتی، بـەڵام لـە بارەی کۆمەڵگەوە، کۆمەڵگە ئەندامێك لەدەست دەدات کـە چـالاك و بـەتوانابوون کەچی بەهۆی مەی خواردنەوە یاخود بەکارهێنانی مـادەی هۆشـبەرەوە بوونەتـە کەسانی لەکارکەوتووی کۆمەڵایەتی، سەرخۆش یـاخود بێهـۆش و ڕەفتارەکانیـان خراپە و ناتوانن بە کارەکانیان هەڵبستن و کـارێکی بـاش پێشکەش بـە کۆمەڵگـە بکەن، هەروەها لەوانەیە سەرچاوەی ئازار و نەهامەتی بن بۆ کۆمەڵگە بەهۆی ئەو ڕەفتارانەی لەوانەیە دوژمنکارانە یان ناشیرین بن وەکو دزی و کوشتن.

### ٢- ئالوودەبوونی کاتی:

لە ئەنجامی کارەساتێك یاخود گرفتێك یان بە ڕێکەوت تووش دەبێت و دواتر وازی لێ دێنێت. بەمجۆرە کۆمەڵگە ئەم کەسانەی لە کیس دەچێ و ئەمانە دەبنە بارێکی گرانی سەرشانی کۆمەڵگە و سوودیان بۆ خۆیان و خێزان و کۆمەڵگە نابێت.

### هۆیەکانی ئالوودەبوون :

١- بێکاری و دەستبەتاڵی پاڵ بە تاکەکانی کۆمەڵگەوە دەنێت خوو بدەنە ئەم رەفتارە نەشیاوە.

٢- هاوڕێی خراپ و لەڕێلادراو کاریگەری لەسەر کەسەکان دەکات و فێری خوو رەفتاری خراپی دەکات.

٣- چاولێکەری کەسانی دەوروبەری خۆی وەکو باوك یان برا یان کەسێکی نزیك.

٤- باری ئابووری و بوونی سەرمایە و پارەی زۆر تاکەکان بەرەو ئەم رەفتارە دەبات.

٥- بێهێزی بیروباوەڕی ئایینی وا دەکەن لاوان گوێ بە هیچ خراپە و چاکەیەك نەدەن.

٦- بەهەڵە تێگەیشتن لە ئازادی و شکاندنی هەموو پێوەرێکی مرۆڤایەتی لە پێناو حەز و ئارەزووەکان.

٧- کەسانی ویژدان مردوو بەمەبەستی بازرگانیکردن و خۆ دەوڵەمەندکردن ئەم مادده بێهۆشکەرانە لەنێو کۆمەڵگە بڵاویکەنەوە.

### چارەسەرکردن :

١- پێویستە بە ڕێگای پزیشکییەوە پشکنین و چارەسەریان بۆ بکرێت و دەرمان و دەرزی تایبەت بەم مادانە هەبێ.

٢- دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی ئەم کردارە.

٣- چارەسەری کێشەی دەروونیان بۆ بکرێت.

٤- چارەسەری کێشەکانی خێزان و کێشەکانی کارکردن بکرێت بەوەی بۆ سەر کارێکی دیکە و شوێنێکی دیکە بگواسترێتەوە.

٥- سزای توند بۆ ئەو کەسانە دابنرێ کە تلیاك و مادەی هۆشبەر دەهێنن و ئەو کەسانەش کە یاریدەیان دەدەن و چاودێری کارەکانیان بکرێت.

٦- باجی زۆر بسەپێنرێتە سەر مەی و شوێنەکانی فرۆشتنی مەرج دابنێ لەسەر ئەو کەسانەی دەچن بۆ کڕینی تەمەنیان لە(١٨) ساڵ کەمتر نەبێت.

٧- داخستنی شوێنەکانی مەی خواردنەوە لەکاتێکی زوودا.

## حەوتەم - کێشەی کەتنکاری نەوجەوانان:

کەتنکردن جیایە لەگەڵ کرداری تاوانکاری، تاوانکاری ئەو کەسانە پێی هەڵدەستن کە تەمەنیان نەوجەوانیان تێپەڕاندووە، کەچی کەتنکردی ئەمانە تەمەنیان لە (١٨) ساڵ تێنەپەڕیوە و هەرچەندە هەمان تاوانی وەك دزی و تاوانەکانی دیکە ئەنجام دەدەن، بەڵام تاوان هەژمار ناکرێت بەڵکو کەتنکردن و زاراوەی تاوانباری پێ ناگوترێ، بەڵکو بە کەتنکار دادەنرێ، کەتنکار لە داداگای نەوجەوانان دادگایی دەکرێ دیاردەی کەتنکاری نەوجەوانان دیاردەیەکی ترسناکە و لە منداڵییەوە بەهۆی کێشەکانی خێزان و کۆمەڵ دەستپێدەکات، لەرێدەرچووان بەهۆی بێسەرپەرشتی و پەرتەوازەیی فێری دزی و قۆڵبڕی و دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکی دیکە دەبن و ژیانی خەڵکی دەخەنە دڵەراوکێ و مەترسییەوە و هەندێکیان دەستەیەك بۆ ئەنجامدانی تاوانەکانیان لەگەڵ یەکتری پێکدێنن و کۆمەڵگە نارەحەت دەکەن.

## هۆیەکانی کەتنکردن:

١- **هۆکاری بایۆلۆژی:** هەندێ لە زانایان ئەم رەفتارە وا لێکدەدەنەوە کە پاشماوەی بایۆلۆژییە و تاوانێکی خۆڕسکە، یانیش لە ئەنجامی کەموکورتی مێشك و ناشارەزایی هەندێ کەسانە بە تایبەتی ئەوانەی لە یاسا و رێسایی بنچینەیی کۆمەڵ ناگەن و ناتوانن پەیڕەوی بکەن.

٢- **هۆکاری دەروونی:** هەندێ لە کۆمەڵناسی دیکە دەڵێن ئەم رەفتارە دەگەڕێتەوە بۆ نالەباری باری دەروون و گرێی دەروونییەکان کە لە ژیانی هەندێ کەس هەر لە منداڵییەوە و هەندێ جار لە قوتابخانە یان لە خێزان و ژینگەی کۆمەڵایەتی

سەرهەڵدەدەن، قوتابی گوێ بۆ ئامۆژگاری شل ناکات و کەمتەرخەمە بەرامبەر ڕێنماییەکان و حەز لە کاری توندڕەوی دەکات.

٣- **خێزان**: خێزان ڕۆڵێکی گرنگ لە پەروەردەکردنی منداڵان دەبینێ کە گرنگترین قۆناغی ژیانی مرۆڤە، بۆیە هەر کەموکورتییەکی کاری پەروەردەکردن لە بارەی زانیاری و ڕێنمایی و بایەخ نەدان بە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری منداڵ و پەیوەندی بە کۆمەڵگەوە، دەبێتە مایەی لاوازی منداڵ لە تێگەیشتنی برگە سەرەکییەکانی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و نەزانینی بەها و واتا باڵاکانی. هەروەها ڕێبازی توندوتیژی و لێدان و داپلۆسین و سووکایەتی دەرهەق بە منداڵ ناسنامەی ئەو منداڵە تێکدەدات و بڕوای بەخۆی و بە کەسانی بەرامبەری لاواز دەکات و ڕێز نە لە خۆی و نە لە کەسانی دیکە دەنێت. تێکچوونی خێزان پەیوەندیەکی هێزی لەگەڵ کەتنکار هەیە، چونکە خێزان و ژیانی نێو خێزان وەك دۆزەخیان لێدێت بەهۆی زۆری کێشە و ناتەبایی و نەمانی دڵسۆزی لە خێزان دوورەپەرێز دەبن و نەوجەوان لەماڵەوە دەردەچێت و لە هاوشێوەی خۆی دەگەڕێت و تووشی کاری خراپ دێ.

٤- **بارودۆخی قوتابخانە**: قوتابخانە یان خوێندنگا جیهانێکی نوێیە دووەم جێگای منداڵە پاش خێزان و گەر هاتوو منداڵ لە خێزانەکەیدا بە خۆشی و شادی پەروەردە کرا بێ، دەبێ قوتابخانەش ببێتە تەواوکەری قۆناغی یەکەم و نەك ببێتە مایەی مەینەت و ئەشکەنجەدانی دەروونی، گەر هاتوو قوتابی لە نێو خێزانەکەشیدا ناڕەحەت بوو ئەوا دەبێ لە قوتابخانە ئەو کەموکورتییەی پڕ بکاتەوە و چارەسەری بۆ بکات و ببێتە دەزگایەك بۆ ئارامی قوتابی و مایەی بەختەوەری و ئامۆژگاری.

٥- **ژینگە**: زاراوەی (ژینگەی سروشتی) گەر مەبەست لێی زەوی و ئاو و هەوا و ڕووەك بێت کەچی لە هەمان کاتدا بە مانای شوێنی نیشتەجێ بوون و ئەو ناوچەیە یاخود یاخود ئەو جێگانەی تێیدایە بەکاردێت، هەروەها زاراوەی ژینگەی کۆمەڵایەتی کە مەبەست لە ژینگەی ئەو ناوەندە سرووشتی و کۆمەڵایەتی کە مرۆڤ تێیدا دەژیت، چونکە لەوانەیە شوێنی گوزەرانی خراپ بێ چ لە باری تەندروستی و چۆنیەتی جێگەی

ژیانی، یان بوونی کارگە و دوکانی پیشەیی لە دەوروبەری شوێنی گوزەرانەکە، جگە لە بڵاوبوونەوەی شێوەکانی رابواردن وەك سینەما و مەیخانە لە نێو کۆمەڵگەدا.

ژینگەی کۆمەڵایەتی کارێکی راستەوخۆ دەکاتە سەر پەروەردەکردنی منداڵ، چونکە گەر هاتوو ئەو ناوەندەی کە تییاندا دەژی ناوەندێکی خراپ و خاوەن رەفتار و هەڵسوکەوتی ناشرین بن ئەوا کاریگەرییەکی گرنگ دەکاتە سەر منداڵەکە رەنگدانەوەی بەسەر رەفتار و هەڵسوکەوتەکانی دەبێ.

جا وا هەڵدەکەوێ کە ئەم ناوەندە کۆمەڵایەتییە کەسانی جۆراوجۆری خاوەن دابونەریت و خووڕەوشتی جیاجیای تیادا گوزەران دەکات و نەوجەوان هەرچی لەسەر زمانی ئەمان هەیە فێری دەبێ و رەفتاری کرێکار و خاوەنکار و ئەوانەی شەیدای سینەما و مەیخانەن کاری تیادا دەکەن و لەرێگەی راست لای دەدەن.

## چارەسەرکردن:

لەبەرئەوەی کێشەی کەتنکاری چەندین هۆکاری هەیە، بۆیە لایەنەکانی چارەسەرکردنی جۆراوجۆرت، وەك ئەوانەی خوارەوە.

١- **چارەسەرکردنی پزیشکی:** گەر هاتوو کەتنکار کەم عەقل و کەمهۆشی بەهۆی کەموکورتی لە دەمارەکانی مێشك یان دووچاری نەخۆشی دەروونی بێت، ئەوا دەبێ پزیشکی پسپۆر لەم بوارە چارەسەری بکات.

٢- **چاودێریکردنی دروستی خێزان:** دایکان و باوکان دەبێ ناکۆکی و ناتەباییەکانی نێوان خۆیان بخەنە لایەکەوە لەبەردەم منداڵەکانیاندا، دەمەقاڵێ نەکەن و دژایەتی یەکتر نەکەن و بە سووك ناوی یەکتر نەهێنن و پێداویستییەکانی منداڵەکانیان دابین بکەن و کاتی بەفیرۆچووی بۆ بکەن بە کاتێکی سوودبەخش و هاریکاری قوتابخانە بکەن لە چۆنیەتی پەروەردەکردنیاندا.

٣- **قوتابخانە:** تا رادەیەکی قوتابخانە دەتوانێ رۆڵی خۆی بگێڕێ لە کەمکردنەوەی دیاردەی کەتنکاری لە رێگەی ئەم شێوازانەی خوارەوە:

أ- پەیرەوکردنی شێوازەکانی پەروەردەی راست و دروست.

ب–کرداری توندوتیژی لەگەڵ قوتابیانی منداڵ پەیرەو نەکرێت.

ج – جیاوازی نەکردن لە نێوان قوتابیان.

د– ڕێزگرتن لە دەسکەوتیان و پشتگیری کردنیان.

هـ– دەستنیشانکردنی ئەو قوتابیانەی کە دووچاری تەنگو چەڵەمەی دەروونی بوونەتەوە لە نێوان خێزانیاندا نارەحەت و ناهەموارن و کاری پێویست بۆ چارەکردنی کێشەکە ئەنجام بدەن.

و– دەست نیشان کردنی سەرەتای کەتنکاری لای هەندێ لە قوتابیان و بە هاوکاری خێزان هەوڵبدرێت ڕێنمایی بکرێن.

ز – دیاری کردنی باری نەخۆشیە جەستەیی و دەروونیەکان بە مەبەستی چارەسەر کردنیان.

٤– **جێبەجێکردنی یاسای چاودێریکردنی نەوجەوانان:** ئەو یاسایەیە کە بە شێوەیەکی ورد دانراوە لەپێناو کردنەوەی دەزگاکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی بۆ نەوجەوانانی کرێکار وەردەگرێت و دەخرێتە بەر چاودێری پاش برانەوەی سزا بۆ کەتنکاران تا جارێکی دیکە ببنە ئەندامێکی بەسوود بۆ کۆمەڵگە.

٥– **لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی:** ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی بەردەوام تایبەت بە دیاردەی کەتنکاری ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێشکەش بکەن.

٦– **بەشداری ڕێکخراوە مەدەنییەکان:** سەندیکای ئافرەتان و ژنان و شانبەشانی ڕێکخراوەکانی قوتابییان و خوێندکاران دەبێ بە تەنگ کێشەکانی قوتابییانەوە بن و پەیوەندی لەگەڵ خێزانیان ببەستن.

## هەشتەم: خۆکوشتن (الانتحار) :

یەکێك لەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەی کە ئەمڕۆ لە جیهان و لەناو کۆمەڵگەی ئێمەشدا بەرچاودەکەوێ، دیاردەی خۆکوشتنە.

دیاردەی خۆکوشتن دیاردەیەکی دەروونی – کۆمەڵایەتییە و مرۆڤ خۆی بریار لەسەر کوشتنی خۆی دەدات، ئەم بریارەش کارێکی زەحمەت و گرانە و لە ئەنجامی چەندین

هۆکاری کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری و بۆچوونی تایبەتەوە پەنا بۆ ئەم کارە دزێوە دەبرێ، خۆکوژی دەرئەنجامی داخرانی دەرگاکانە بە رووی مرۆڤەکان و مرۆڤ کاتی هەست بە دۆڕانی ژیان و لەدەستدانی بەها جوانەکانی ژیانە، یان لە ئەنجامی ئەو پەڕی بێزاربوونە لە ژیانی خۆی و لاوازی لە بەرامبەر پێشهاتەکانی ژیان و دوارۆژی، بڕیاردان لەسەر خۆکوشتن کارێکی وا ئاسان نییە، ئەگەر پاڵنەر و هۆکاری زۆر مەزنی لە پشتەوە نەبێت، ئەنجام نادرێت، بۆیە مرۆڤ پێویستە بەرامبەر کێشە و ئاستەنگەکانی ژیان بەهێز بێ و وا بە ئاسانی دانەڕمێ و خۆی نەخاتە ژێر فشاری مەرگەوە..

یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانە شکست خواردنی مرۆڤە لە کار و ژیاندا، واتە مرۆڤ نەتوانێ بە شێوەیەکی تەواو سوود لە هۆشمەندی و تواناکانی خۆی وەربگرێت، بۆیە سەرکەوتنی مرۆڤ هیچ پەیوەندییەکی بە پایەی کۆمەڵایەتی یاخود توانای دارایی و هەژاری و دەوڵەمەندییەوە نییە، باشترین هۆکار و پاڵنەری سەرکەوتن خودی کەسەکەیە بۆ ئەوەی لە ژیان بەختەوەر و ئاسوودە بێت، وەك لای هەمووان ئاشکرایە دیاردەی خۆکوشتن بۆتە یەکێك لە کێشە کۆمەڵایەتییە بڵاوەکانی کۆمەڵگە نوێیەکان و زۆربەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگە گرتۆتەوە بە تایبەتی لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا، یەکێك لەو کۆمەڵگەیانەی کە رووبەڕووی ئەم دیاردە نەشیاو و نامۆیە بۆتەوە کۆمەڵگەی کوردەوارییە، بە تایبەتی زۆرتر لە نێو ئافرەت و کچان بەرچاو دەکەوێ، هەندێك لە ژنان یان کچان بەهۆی گیروگرفتەوە پەنا بۆ ئەم شێوازە نەخوازراوە دەبەن.

## گرنگترین هۆکارەکانی خۆکوشتن:

١- تێکچوون و ئاڵۆزبوونی باری دەروونی و کۆمەڵایەتی کەسەکە، بەهۆی گیروگرفتی ئابووری و گرانی ژیان و گوزەران.

٢- بێ هیوابوون و رەشبینی بەرامبەر بە ژیان و ئایندە، ئەمەش بەهۆی لاوازی کەسێتی و ناهۆشیارییەوە.

٣- زۆر لێکردن و فشاری کۆمەڵایەتی لەلایەن کەسە نزیکەکانی وەك باوك و برا و خێزان.

٤- بەهاو دابونەریتەکانی کۆمەڵگە کاریگەری سەرەکی لەسەر کەسەکە هەیە، بەهۆی رەفتار و هەڵسوکەوتی هەڵەوە.

٥- پشتگوێخستنی لەلایەن خێزان و کۆمەڵگە و بە کەم سەیرکردنی وا لە کەسەکە دەکات هەست بە نامۆبوون بکات.

## جۆرەكانی خۆكوشتن:

خۆكوشتن چەندین جۆر و شێوازی تایبەتی هەیە:

١- **خۆكوشتنی بزواندن:** ئەمجۆرە خۆكوشتنە بۆ ئەوەیە هەستی دەوروبەرو كەسان نزیكی خۆی ببزوێنێ و كاریگەریان لەسەر بەجێبهێڵێ، وەك خۆسووتاندنی كەسێك لە پێناوی خۆشەویستەكەی كە ئەمەش لێكدانەوەی هەڵە و ناڕاستە.

٢- **خۆكوشتنی نموونەیی (گیانفیدایی):** ئەمجۆرە بریتییە لە خۆكوشتنی سەربازێك لە پێناو نیشتمانەكەی یان پێشمەرگەیەك بۆ كوردستان بە ویستی خۆی ئەم گیانفیداكاریە هەڵدەبژێرێ خۆی رادەستی دوژمن ناكات ئەمە جۆرێكە لە خۆكوشتن لە پێناو بیروباوەڕێك.

٣- **خۆكوشتنی ناچاری:** كەسێك تووشی دارمان و بێئومێدی دەبێت وەك ئەو سەرمایەدارەی لەناكاو ئیفلاس دەكات لە داخان خۆی دەكوژێت.

٤- **خۆكوشتنی بێئومێدی:** واتە ئەو كەسەی لە هەموو ژیان بێئومێد دەبێ دونیای لەلا رەش دەبێ و ئەم رێگەیە بە باشترین رێگە دەزانێ و هیچ رێگەچارەیەكی دیكە بەدی ناكات.

## چۆنیەتی چارەسەركردن:

١- چارەسەركردنی باری دەروونی كەسەكان لە رێگەی بنكەی تەندروستی و پیسپۆڕانی بواری دەروونی.

٢- بڵاوكردنەوەی هۆشیاری لە رێگەی بوارەكانی راگەیاندن و رۆژنامە و تەلەفزیۆن و رادیۆ لەمەڕ خراپی بە ئەنجامگەیاندنی ئەمجۆرە كردارە.

٣- نەهێشتن و كەمكردنەوەی گرفتە دارایی و نیشتەجێكردن و پێداویستییە خێزانییەكان.

٤- گرنگیدان بە لاوان و كەموكورتییەكانی ژیانیان بۆ ئەوەی هەست بە بێئومێدی و نامۆبوون نەكەن.

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

پ١/ بەپێی بیروبۆچوونی زانایان و پێناسەکانیان کێشەی کۆمەڵایەتی دیاریی بکە؟

پ٢/ کێشەی کۆمەڵایەتی دوو مەرجی هەیە چین؟

پ٣/ رۆڵی کۆمەڵناسی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵایەتی؟

پ٤/ رێبازەکانی کۆمەڵناسی راڤە بکە لە چارەسەرکردنی کاری تاوانکاری بدوێ؟

پ٥/ لێکهەڵوەشانەوەی خێزان چییە و چۆن چارەسەر دەکرێت؟

پ٦/ کۆچـــکردن کێـــشەیەکی کۆمەڵایەتییـــە، جۆرەکـــانی کۆچـــکردن چـــین؟ چارەسەرکردنیان ئاماژە پێ بکە؟

پ٧/ گرنگترین کێشەکانی منـداڵ دیـاری بکـە و چارەسـەرکردنەکانی دەستنیـشان بکە؟

پ٨/ ئاکامەکانی مادە هۆشبەرەکان و مەی خواردنەوە و چۆنیەتی چارەسەرکردنی باس بکە.

پ٩/ لەرێدەرچوونی لاوان چییە و هۆیەکانی چین؟

پ١٠/ خۆکوشتن دیاردەیەکی دەروونی — کۆمەڵایەتییە، هۆکارەکانی چین؟

**چالاکی:**

(( کێشەیەکی لاوان بکرێتە تەوەر و قوتابییان و مامۆستای بابەت گفتوگۆی لەسـەر بکەن))

# ڕێککاریی کۆمەڵایەتی ( الضبط الاجتماعي )

مەبەست لە (ڕێککاریی کۆمەڵایەتی) ئەو شێواز و ڕێبازەیە کە کۆمەڵ پەیڕەوی دەکات تا ئەندامانی ملکەچی ڕێساکانی کۆمەڵایەتی ببن و خۆیانی لەگەڵ بگونجێنن.

پێناسەیەکی تری ڕێککاریی کۆمەڵایەتی وای لێك دەداتەوە کە: ئەو شێوازەیە کە کار لەسەر ڕێکخستنی قەوارەی کۆمەڵایەتی دەکات و دەپارێزێت و هاوسەنگییەکەی لەکاتی هەر گۆڕانێك جێبەجێ دەکات. هەروەها ڕێککاریی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی بێ ئاگایی جێبەجێ دەکەین، چونکە ئێمە لەسەری ڕاهێنراوین و بوونەتە بەشێك لە ئێمە و ئێمەش کە لەدایك دەبین، دەبینین یاساکانی ئەم دابینکارییە پێش ئێمە هەبووە و لە ئەنجامی پەروەردەی خێزان و فێربوون لە کۆمەڵدا شارەزاییمان لێ پەیداکردووە، کەواتە ئێمە بە پێی ڕێبازی خێزان هەڵسوکەوت دەکەین. پێش چوونە قوتابخانەمان بێئەوەی بیری لێ بکەینەوە لە ڕێگادا ڕێبازەکانی ڕەوشتی گشتی جێبەجێ دەکەین، وەك چاك و چۆنی لەگەڵ هاوڕێکانماندا دەکەین و پێی دەڵێین (ڕۆژ باش).

### ئامانجەکانی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی:

ئامانج لە ڕێککاریی کۆمەڵایەتی ئاراستەکردنی ڕەفتاری تاکەکانە و ڕێککارییە سەرباری ئەوەش کاریگەری هەیە لەسەر تاکە کەسان و کۆمەڵان لەکاتی کارو کردەوەی ڕۆژانەیان بۆ ئەوەی کە یاسا و دابونەریت و بەهاکانی ئایینی و ڕەوشتە باوەکان و بنچینەکانی کارکردن و پێڕەوی کۆمەڵایەتی لانەدەن، تاوەکو کەسەکان دەستدرێژی نەکەنە سەر یەکتر جا چ بە ئاخافتن یان بە لێدان یان کوشتن یان دەستدرێژیکردنە سەر کەلوپەل وەك دزیکردن و وێرانکردن، کەواتە ڕێککاریی

کۆمەڵایەتی ڕێبازێکە کۆمەڵگە بەرگری لە ڕێکخراو بوون و بەردەوامی بەها و یاسا و شوێنی پیرۆز و کەلوپەل گشتییەکان دەکات و گیانی تاکە کەسان و ئاسایش و ماڵ و سامانیان دەپارێزێت.

یەکێ لە ڕێبازەکانی ڕێککاریی برینەوەی سزایە بۆ ئەوانەی ڕێی چەوت دەگرنە بەر و پاداشیشە بۆ ئەو کەسانەی دەستوورەکان جێبەجێ دەکەن، ڕێبازەکانیشی بریتین لە خێزان و دەستوورەکانی و دەوڵەت و یاساکانی و ئایین و سەرکردایەتی و داب و ڕەوشت و ڕەفتار و ڕای گشتی، بۆ نموونە ئامۆژگارییە دەزگا کۆمەڵایەتییەکان دەستووری ڕەخساوە پەیڕەو تێیدا بریتییە لە دەستوورەکانی ڕێککاریی.

## ئەرك و فرمانەکانی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی:

١- پاراستنی هاوسەنگی ژیانی ڕۆژانە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك.

٢- هاوسەنگکردنی بونیادی کۆمەڵایەتی لەمیانەی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و دانانی بناغە و بنچینەکانی کارو کارتێکردنی نێوان کۆمەڵان و دەزگاکانی کۆمەڵایەتی وەك (خێزان، قوتابخانە، فەرمانگەکانی دارایی و یاسایی، نەخۆشخانەکان، بنکەکانی تەندروستی).

٣- بەرگریکردن لە پەیڕەوی کۆمەڵایەتی و دەزگاکانی و یاساکانی شوێنە پیرۆزییەکانی و پاراستنی لەو کەسانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە یان هەوڵی تێکدانی دەدەن.

٤- پشتگیریکردنی هەنگاوەکانی هەندێ لەو دەزگا کۆمەڵایەتیانەی کە لە چاو دەزگاکانی تر دواکەوتوون، تا بگەنە ئاستی ئەو دەزگا کۆمەڵایەتییانەی کە لە چاو دەزگاکانی تر دواکەوتوون بە تایبەتی لەکاتی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی کتوپڕ و خێرادا: بۆ نموونە لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشە میللییەکانی وەك شۆڕشی فەڕەنسا ساڵی ١٧٨٩ و شۆڕشی (١٤)ی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ لە

عێراق کە هەندێ لە دامودەزگاکانی دەوڵەت کاروباری خۆیان هەر لەسەر ڕێبازی کۆن بەڕێوەدەبرد، بۆیە دەوڵەت یاسای نوێی دەرکرد تا ئەم دامودەزگایانە بەپێی یاسا کار بکەن و پێشکەون و ئەوەی سەرپێچی بکات سزای بۆ دەبڕێتەوە.

٥- زاڵبوون بەسەر ڕەفتاری تاکە کەسان بەو شێوەیەی کە لەگەڵ بەهاو خووڕەوشت و یاساکان و شتە پیرۆزەکانی کۆمەڵایەتی بگونجێ و ڕێککەوێ.

٦- پاراستنی ژیان و شکۆمەندی هاوولاتییان هێرشکردنە سەری، ئەویش لە ڕێگەی پاراستنی ماڵ و سامانی تاکە کەسان و کۆمەڵ بە گشتی، لەگەڵ پاراستنی دامودەزگاکان و پرۆژەکانی هەمەجۆر و ئامێر و شێوەکانی گەیاندن لە کاری خراپەکاری تێکدان و دزین و تالانکردن.

## گرنگی ڕێککاری کۆمەڵایەتی :

هەمووومان هەست بە گرنگی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی دەکەین لە ژیانماندا وەك سیستەمێکی ژیانی کۆمەڵیش دەرکی پێدەکەین بەوەی:

١- ڕەفتارەکانی نێوان کەسانی نێو کۆمەڵگە ڕێکدەخات.

٢- ڕێکخستنی پەیوەندی لە نێوان دەزگاکان بە یەکترییەوە دەگونجێنێ بە شێوەیەك کە کاروبارەکانیان بەیەکدا نەبێ.

٣- دەستەبەرکردنی هێمنی و ئاسودەیی بۆ وەدەستهێنانی بەرهەمی چاك و زۆر.

٤- دەستەبەرکردنی بواری پێشکەوتنی زانیاری و کۆمەڵایەتی تا ببێتە مایەی خۆش و شادی کۆمەڵ.

شتێکی ئاسایی و سرووشتییە هەریەکە لە ئێمە پێویستی بەم شێوازانەی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی هەیە و دەبێ برگەکانی لەگەڵ خۆی و بەرامبەر بە خەڵکی جێبەجێ بکات و بەڕووی لەرێدەرچووان و لەخشتەچووان بوەستێ تا ئەم پەیڕەوە پێشێل نەکەن و پشتگوێی نەخەن، دەبێ ئەوەش بزانین کە سزا

دەبێتــە بەشــی ئــەو کەســانەی لــەم شــێواز و ڕێبــازە لادەدەن و لــە کۆمــەڵ دادەبڕێن.

هەر کەسێك سەرپێچی بنچینەکانی دابینکاریی کۆمەڵایەتی بکات دەبێتـە هـۆی سـزادانی، کۆمەڵگـەش بـە چـاوێکی سـووکەوە سـەیری دەکـات یـان دووری دەخاتەوە لە کۆمەڵگەدا.

## شێوازەکانی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی:

جـاران بـە چـاوێکی خراپـەوە سـەیری ڕێککارییـەکانی کۆمەڵایـەتی دەکـرا بـەوەی بریتییە لە کۆمەڵە بەها و یاسایەك کە بەسەر خەڵکی سـەپێندراون، هاووڵاتییـان لـە ترسی سەپاندنی سـزا و لێپچینەوە ملکەچی دەبن، بـەڵام پـاش لێکۆڵینەوەیـەکی قـووڵی زانایـان بـۆ ئـەم بابەتـە ئـەوەیان سـەلماند کـە خـەڵکی زۆر بـە ئاسـایی ڕێککارییـەکان لـە ژیانـدا پـەیڕەو دەکـەن، چـونکە بۆتـە بەشـێك لـە ناسـنامەیان و لەلایان پەسندە و هەندێکیش پاداشتی دارایی و کۆمەڵایەتی لێیەوە ڕەچاو دەکەن.

**ئـەوەی شـایانی باسـە ڕێککـاریی کۆمەڵایـەتیش لەسـەر دوو بنـچینە دامـەزراوە: یەکێکیان سزایە و ئەوەی دیکە پاداشتە، لەمەودوا باسی چەند ڕێبازێکی ڕێککاریی جۆراوجۆر دەخەینە بەرچاو.**

### أ- مەشقکردن و ڕاهاتن:

ئەم شێوازە بە ڕێبازێکی چاك دەناسرێ، چونکە لەسەر گوشار و بەرپەرچـدانەوە و سزا دانەمەزراوە کە ئەم شێوازە بە شێوازێکی نەگەتیڤ دادەنرێ، چونکە کۆمەڵگـە لە ڕێگەی مەشقکردن و ڕاهاتنەوە هاووڵاتییان فێری ڕێککاریی کۆمەڵایـەتی دەکـات بۆ ئەوەی بیکەن بە بەشێك لە کەسایەتی تاکـەکان و لـە ژیـانی ڕۆژانەیانـدا، ڕۆژانـە بەبێ بیرکردنەوەو هەستپێکردنی جێبەجێی دەکـەین، بەمـەش **کۆمەڵگـە ڕێککـاریی ناوخۆ پێك دێنێت کە ئەمانە دیارترین لایەنە باشەکانیەتی:**

١- خەڵکی هەر لە خۆیانەوە بەبێ بیرکردنەوە و بە ئاسانی جێبەجێی دەکەن نەک لەترسی سزادان یان دەسەڵات، بەڵکو بە رەزامەندی خۆی و خۆشەویستی بۆ رێساکانی کۆمەڵایەتی ملکەچی دەبێت، ئەمەش چاکترین جۆری رێککارییە.

٢- جۆرە گونجانێك لە نێوان خەڵك و تاکەکەس و کۆمەڵاندا دێنێتە کایەوە و جۆرە گونجاندنێك لە شێوازی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانەوە دروست دەکات.

٣- ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگە سووك دەکات و دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەو ئەرکەی کە بۆ چاودێری لەرێدەرچووان تەرخانی دەکات، جگە لەو برە پارەیەی کە بۆ دامودەزگاکانی چاودێری دادوەری وەك دەزگاکانی پۆلیس و دادگا و بەندیخانەکان تەرخان دەکرێت کەم دەبێتەوە.

**ئەو رێگایانەی کە کۆمەڵگە بۆ کاری مەشق و راهێنان پەنای دەباتە بەر ئەمانەن:**

**١- پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی:**

ئەو شێوازە پەروەردەکردنە خێزانییە دەگرێتەوە کە لە رێگایەوە رۆڵەکانی کۆمەڵگە ئاراستە دەکرێن و فێردەبن و رادەهێنرێن و بەهۆی هاندانی خێزانەوە بەهاکانی کۆمەڵ و رەفتار و ئایینی کۆمەڵ و خوورەوشتی چاك پەسەند دەکەن و لەکاری نارەوایە دوور دەکەونەوە و پەیرەوی کارە پەسەند و بەجێیەکانی نێو شارستانییەتی کۆمەڵ دەکەن و قۆناغەکانی پەروەردەکردنی بە درێژایی ژیان لە قۆناغی قوتابخانە و زانکۆ و بوارەکانی دیکەی ژیان درێژەی بۆ هەیە.

٢- فێرکردن:

فێرکردن لە قوتابخانە و خوێندنگە و پەیمانگە و لە زانکۆکاندا بە ڕێبازێکی چاکی فێرکردنی دابونەریت و یاساکان و بنچینەکانی کارتێکردن دادەنرێت و بە هۆیەوە قوتابییان لە میانەی قۆناغەکان خوێندن فێری برگە سەرەکییەکانی ڕێککاریی دەبن و پێی رادێن.

٣- پاداشت:

منداڵ یان مرۆڤێکی گەورە، گەر هاتوو لە نێو کۆمەڵ یان لەناو خێزان یان لە شوێنی کارکردنی پابەند بوو بە خووڕەوشتی چاك و ڕەفتاری باش، ئەوا دەبێتە مایەی ڕێزلێنانی کۆمەڵ و پلە و پایەی چاکی بۆ دابین دەکرێت یان هەندێ جار پارەی وەك پاداشتێك بۆ پێشکەش دەکرێت تا بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئەم ڕەوت و ڕێبازە بەردەوام بێت.

٤- بیروباوەڕەکان:

بیروباوەڕ چەندین بنەما و بابەتی ڕەوای یاسایی و شتە بەهادارەکانی نێو کۆمەڵ دەگرێتەوە و هەموو ئەم لایەنانەش پیرۆزدار دەبن، چونکە بە بەها پیرۆزەکانەوە بەستراونەتەوە ئەمە لەلایەکەوە و لەلایەکی دیکەوە خەڵکی بە پەیوەندییەکی سۆزداریەتی بە ئایین و بیروباوەڕە پیرۆزەکانیان بەستراونەتەوە، بۆیەش هەر شتێکی کۆمەڵایەتی لەناخیاندا هەبێت لەلایان خۆشەویستە و بە گرنگی جێبەجێی دەکەن.

٥- بڕواپێهێنان:

کۆمەڵگە لە ڕێگای لێکۆڵینەوە و گفتوگۆکردن لەسەر بنچینەکانی ڕێککاریی کۆمەڵ ڕەزامەندی هاووڵاتیانی بەدەست دێنێ بەوەی کە ئەمانە بە کەڵکن و لە بەرژەوەندی کۆمەڵدان.

٦- چاولێکەری و لاساییکردنەوە:

خەڵکی وا راهاتوون ئەو رەفتارانە دووپاتکەنەوە کە باوك و دایك یان مامۆستایان و خەڵکی دیکە لێی فێربوونە، ئەم رەفتارە جۆرە چاولێکەرییە بە تایبەتی کاتێ کە بە هەمان رێگا دووبارە دەبێتەوە و خەڵکی بەم شێوەیەش لاسایی دەکەنەوە.

## ب- گوشار و بەرپەرچدانەوە:

ئەمجۆرە کردارە بە رێبازێکی چاك و لەبار دانانرێ، هەرچەندە ئەم وەسفە مانای هەڵە یان خراپێتی ناگەیەنێ، چونکە رێککاریی کۆمەڵایەتی لە بنەڕەتدا پشت بە دوو بنەمای سەرەکی دەبەستێت کە بریتیین لە پاداشت و سزا، هەرکاتێ کە رێبازی مەشق و راهاتن لەگەڵ کەسێك سوودی نەبوو، ئەوا کۆمەڵ بە توندی بەرەنگاری دەبێتەوە و لێناگەرێ زەرەر و زیان بە کۆمەڵگە بگەیێنێ و ناوبراو قەدەغە بکات و دەستدرێژی بکاتە سەر یاسا و پێشێلی بکەن و هەرەشە لە ژیانی و لە شکۆمەندی کەسان و ماڵ و سامانیان بکەن بۆ ئەوەی پەلاماری دەزگاکانی کۆمەڵگە و پەیڕەو و بەها پیرۆزەکانی نەدەن.

لەمجۆرە رێککارییانەدا کۆمەڵگە هێز و سزا بەکاردەهێنێ بە (رێککاریی دەرەکی) ناودەبرێت گەر هاتوو لەگەڵ رێککاریی ناوەکی بەراورد بکرێت، وەك چۆن ئاماژەمان بۆ کرد بەوەی کە گوشار لە کۆمەڵگە یان لە دەسەڵاتەوە یان لەلایەن هۆز و دەوڵەتەوە دەخرێتە سەر تاکە کەسان لە ترسی سزادان و لە رێ لانادەن.

## جۆرەکانی گوشار و بەرپەرچدانەوە:

١- رێبازی توندوتیژی:

لەم جۆرە رێبازەدا سزای جەستەیی بە لێدان و سزای بەندیخانە یاخود سزای لە سێدارەدانی بۆ تاوانبار دەبڕێتەوە.

٢- ڕێبازی نا توندوتیژی:

ئـەمجۆرە لێکدابڕانـدنی کۆمەڵایـەتی دەگرێتـەوە و کۆمـەڵ خـۆی لـە کەسـی خراپـەکار دادەبـڕێ و سەرزەنـشتی دەکـەن و بـە چـاوێکی سـووك و کەمـەوە سەیری دەکەن، پاداشتی دارایی لێدەبڕن و سزای کارکردنی بەسەر دەسـەپێنن و کرێی پێ نادەن هاریکاری ناکەین.

## هۆیەکانی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی:

ئەو شێوازانەی کە بە هۆیەوە کۆمەڵگە ڕەفتاری هاووڵاتییـانی بـەپێی یاسـا و بـەها پیرۆزەکـان و بنـچینەکانی ڕەفتـاری ڕەوا دەگـونجێنێ و دەتـوانێ پەیوەنـدی و چـالاکییەکانی کۆمــەڵان و پــەیڕەوەکانی کۆمەڵایـەتی ڕێکبخـات. هۆکارەکـانیش ئەمانەن:

### یەکەم: خێزان

خێزان لەم ڕێگەیانەوە ڕۆلی لە ڕێککاری کۆمەڵایەتیدا هەیە:

١- یەکەم قوتابخانەیە بۆ فێربوون:

یەکـــەم کۆمـــەڵی بەراییـــە، پەیوەندییـــەکانی نێـــوان ئەنـــدامانی خێـــزان پەیوەندییەکی سرووشتی و ئاساییە نەك دەستکرد، دڵسۆزی و هاوکاری و بـڕوا بەیەکتر بوون لە نێوان ئەندامانی باڵی بەسەر پەیوەندییەکان دەپۆشێ، خێزان بە قوتابخانەی یەکەمی پەروەردە و فێرکردن دادەنرێ، تیایدا تاکەکەس فێـری بنچینەکانی ڕێککاریی ڕەفتارەکان دەبن و بە دڵێکی فـراوان ئەنـدامانی خێـزان گوێڕایـەڵی بـۆ ئامۆژگـاری و ڕێنماییـەکان دەکـەن، چـونکە ئەمانـە بـە یەکـەم خانەی کۆمەڵایەتی دادەنرێن لە نێو کۆمەڵگە و لێك نزیکن.

**٢-فێرکردنی چەمکی ڕێککاری شێواز و هێماکانی:**

منـدالّ لـە خێزانەکەیـدا بـەهۆی پـەروەردەکردن و راهێنـان فێـری جۆرەکـانی ڕێککـاریی و بنـەماکانی دەبێـت و لـەم فێربوونـەش پـشت بـە هـەردوو بنـچینە سەرەکییەکە کە (سزا)و(پاداشت)ە، دەبەستێت.

گەرهاتوو مندالّ کـاری چـاك و رەفتـاری چـاك و راسـت و رەوان ئـەنجام بـدات، ئـەوە دیـاری و پاداشـتی پێشکەش دەکـرێ، ئەگـەر هـاتوو لەسـەر ڕێوشـوێنی خێـزان نەڕۆیـشت ئـەوا دووچـاری سـزا و لێپرسـینەوە دەبێـت و هەڕەشـە و گورەشەی لێ دەکرێت.

**٣- فێرکردنی چەمکی بەئەندامبوون لە کۆمەڵگەدا:**

مرۆڤ بەبێ ئەوەی ببێ بە یەکێك لە ئەندامانی کۆمەڵگە ئەوا نـاتوانێ لـە مانـای ڕێککـاریی بگـات و ملکەچـی بـەهاکانی کۆمەلایـەتی و بنـچینەکانی رەفتـار و یاساکان بێت، لە سەرەتادا مرۆڤ لـە نێـو خێزانەکەیـدا هەسـت بـە ئەندامیـەتی خۆی دەکات و دوابەدوای ئەوەش لەوە دەگات کە خێزانەکەی بەشێکی بچووکە لە کۆمەڵگەیەکی گەورە و فـراوان و پابەنـدە بـە یاسـا و بـەهاکانی و هـەمووان گوێڕایەڵی بۆ بنچینەکانی دەکەن، کەواتە ئەویش ئەندامێکە لەو کۆمەڵگەیە.

**٤- مەشق کردن لەسەر بیرۆکەی هاوکاری کردن:**

خێـزان مندالّـەکان فێـر دەکـات چـۆن هەسـتی هاوکـاری لـەلا دروسـت بکـات و چۆنیش یارمەتی ئەندامانی خێزانەکەی بدات، لە بـەڕێوەبردنی بـاری ژیانیـان و کاروباری ناو ماڵی پێ دەسپێرن، ئەوساتە باش لە کاری هاریکاری حاڵی دەبێ، ئەمەشیان بۆ ژیانی کۆمەلایەتی و بۆ کارکردن زۆر گرنگـە و یارمـەتی دەدات تـا باش لە چەمکەکانی ڕێککاریی کۆمەلایەتی بگات و ملکەچی بۆ بکات.

٥- فێرکردنی بیروباوەڕەکان:

مرۆڤ لە ڕێگەی خێزانەوە فێری بیروباوەڕەکانی نێو کۆمەڵگە دەبێت، کە بەبنچینەیەکی گرنگی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی دادەنرێت، وەك یاساکان و دادوەریەتی و رەفتار و چۆنیەتی مامەڵەکردن و پەند و خووڕەوشتەکانی ناو کۆمەڵگە.

٦- فێرکردنی بەها و نەریتەکان:

بەها و دابونەریتەکانی کۆمەڵگە بنەڕەتی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی دەبێت، خێزان یەکەم دەستەیە کە مرۆڤ فێری ئەم بەها و دابونەریتانە دەکات کە کۆمەڵانی خەڵك پەیڕەوی دەکەن و جێبەجێی دەکەن، نابێ لێی لابدەن.

٧- خێزان پەیوەستی نێوان کەس و کۆمەڵگەیە:

خێزان بەکاری گەیاندنی یاساکان و بیروباوەڕەکانی کۆمەڵ هەڵدەستێ و ڕێنمایی پەیوەستبوون بە کۆمەڵگە لەلایان بەهێز دەکات، ئەرکی (ئەندامانی خێزان) دەگرێتە ئەستۆ و لێپرسراوە بەرامبەر بە ڕاهێنان و فێرکردنیان، خێزان هەڵدەستێ بە ناردنی ئەندامانی بۆ قوتابخانە و ڕێنماییە ڕەسمی و یاساکان جێبەجێ دەکات و دامودەزگاکانی کۆمەڵایەتی بەسەر دەکاتەوە.

## دووەم: دەوڵەت

ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتییە و خاوەنی بەرزترین پلەی دەسەڵاتە کە دەتوانێ دەسەڵات بەسەر هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە بسەپێنێ. بنەما سەرەکییەکانی دەوڵەت ئەمانەن:

١- گەل .

٢- خاك.

٣- دەسەڵات.

دەوڵەت کەسێکی مەعنەوی یان یاساییە کە بریتییە لە بە یاساییبوونی گەلێك لە گەلان لەسەر خاکێك، بە مانایەکی دیکە دەربڕینێکی یاساییە بۆ بوونی گەلێك لە گەلان لەسەر زەوی کە تایبەتمەندی خۆی و دەسەڵاتێکی تایبەتی هەیە.
دەوڵەت دەسەڵاتداریەتی لە ڕێگای ئەندامەکانییەوە (ئەندامی حکوومەت) کە ڕەگەزی هێزە وەکو هێزی دەستوور و یاسا و دەزگاکانی ڕاپەڕاندنەوە جێبەجێ دەکات.

## دەوڵەت هۆکارێکی ڕێککارییە :

دەوڵەت بە هۆکارێکی ڕێککاریی دادەنرێت و بەم ڕێگایانەی خوارەوە:

١- دەوڵەت لە سەرانسەری جیهاندا و لە نێو کۆمەڵگەکاندا مافی فشاری هەیە بۆ جێبەجێکردنی یاساکان.
٢- دەوڵەت سەرپەرشتی جێبەجێکردنی یاساکانی لە دامودەزگاکانی پەروەردە و دارایی و تەندروستی و هەموو دەزگاکانی دیکە دەکات.
٣- دەوڵەت یاساکان دادەڕێژێت و هەمواریان دەکات.
٤- دەوڵەت دەتوانێ خێزان وەك هۆکارێکی جێبەجێکردنی ڕێککاریی بەکاربینێ بۆ ئەم مەبەستە بەجێگەیاندنی ڕێنماییەکان و یاساکانی قوتابخانە و دەزگاکانی دیکە بەکاردێنێ، هەروەها لە کاتی پێویست هێزەکانی پۆلیس دەخاتە کار.
٥- دەوڵەت ئاسایش و ئارامی دەپارێزێ و بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە ژیانی هاووڵاتییان و ماڵ و سامانیان و شکۆمەندییان دەخەنە مەترسییەوە.
٦- دەوڵەت پارێزگاری لە شوێنە پیرۆزەکانی کۆمەڵگە و دەزگا و شوێنەوارە ئایینییەکان دەکات.

٧- دەوڵـەت هەنـدێ لـە کەموکوڕییـەکانی نـاو کۆمەڵگـە پـڕ دەکاتـەوە، وەکـو ڕێکخـستنی کـاری هاتوچـۆکردن کـە بـۆ یەکـەم جـار وەك سیـستەمێك بـەکار دەهێنرێت، هەرواش سەبارەت بە سیستەمی ڕێنمایی و بڵاوکردنەوەش.

٨- دەوڵـەت لـەکاتی تـەنگ و چـەڵەمە و بـاری نالـەباری کتـوپڕی وەك لافـاو یـان زەمینلـەرزە و شـەڕ و بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی کوشـندە ئـەوا یاسـای نـوێ و ڕێنمایی نوێ دەردەکات تا خەڵکی بۆ بەرژەوەندی خۆیان کاری پێی بکەن.

## سێیەم: ئایین :

ئایین لە گـرنگترین هۆیـەکانی ڕێککاریـە لـە کۆمەڵگـەدا سەرچـاوەی داد و دادوەری یاسـا و کـار و ڕەفتـاری چـاکە و ڕاسـتی و ڕاسـتگۆیی و کـاری ڕاسـتەقینە و خووڕەوشتی چاك دابین دەکـات و خـەڵکی لـە دەسـتدرێژی سـەر یـەکتری و مـاڵ و سامانیان دەپارێزێت.. ئایین بە گـرنگترین شـێواز لـە شـێوازەکانی دابینکـاریی نێـو کۆمەڵگەکان دەژمێردرێت، ئایین ڕێنمایی پاداشتی چاك لـە دونیـا و لـە دوارۆژدا بـۆ کاری چاك و ڕاست و ڕەوان دەکات، ئاگاداریەکە سەبارەت بە ڕەفتـاری خراپـە لـەم دونیایە و لە دونیای دیکـەدا بـەوەی کـە سـزا دەبێتـە بەشـی ئـەو کەسـانەی کـاری خراپە ئەنجام دەدەن و هەمیشە هەڕەشە لە خراپـە و خراپـەکاری دەکـات و کـاری ڕاستەقینە پەسەند و پەیڕەو دەکات، هەروەها سزا و پاداشت دەستنیـشان دەکـات ئەمانیش بنچینەی سەرەکی کاری دابینکارین.

پیرۆزیەتی ئایین لەوەدایە کە سەرچـاوەکەی خـوای گەورەیـە و هێزێکـی توانـاداری ئەوتۆی ڕێککاریی پێدەبەخشێ و خـەڵکی بـە دڵـسۆزییەوە ملکەچـی ڕێنماییـەکانی دەبن تا خوای گەورە لێیان ڕازی بێت، بەم چەشنەش شێوازەکانی ڕێککاریی لە نێو کۆمەڵگەدا دێتەدی.

## چوارەم: ئایدۆلۆژیەت (بیروڕا):

ئایدۆلۆژییەت وشەیەکی لاتینییە و لە دوو بڕگە پێکدێت (Ideo) مانای بیر و (Logy) مانای زانست دەگەیەنێت کە واتای هزر و بیر دەگەیەنێ، کۆمەڵان و تاکە کەسەکان هەردەم حەز دەکەن بزانن سرووشتی بوون و ماناکەی چییە و پەردە لەسەر نهێنییەکانی لابدەن و لە مانای ژین بگەن و ئامانجەکانی چاکی ژیان بزانن و چاکترین ڕێگا بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجانە چین؟ هەروەها دەیانەوێ ڕێبازە باڵاکانی کارتێکردن و هۆی بوونی مرۆڤ بزانن، بەم پێیە هەر کۆمەڵێك بیروبۆچوونی خۆی دەرهەق بە گێتی و گەردوون و بە کۆمەڵ و ڕێبازە چاکەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەیە ئەمەشیان بە (Ideology) ئایدۆلۆژییەت ناوی دەبەن لە وشەی idea ی واتە بیر وەرگیراوە و شێوازی ئایدۆلۆژی چەندین بیروباوەڕی سیستەمەکانی ژیان و کارتێکردنەکان دەگرێتەوە، کەچی ئایدۆلۆژییەکانی رامیاری بوونەتە بنەڕەت بۆ دامەزراندنی دەوڵەت و یاساکان و فەلسەفەی سیاسی وەك سەرچاوەیەکی یاساکان و ڕێککاریی و ڕەوشتی گشتی کۆمەڵگەکان.

بۆ ئەوەی شێوازی ئایدۆلۆژی ببێتە ڕێبازێکی سەرکەوتووی ڕێککاریی ، پێویستە شێوەی تەواوی هەبێ نەك شێوەیەکی بەشەکی یان دابڕاو، تاکو لایەنەکانی ژیان و دوارۆژ نیشانبدات، بەڵکو دەبێ وێنەی دوارۆژ بە جوانی و ئاسانی بۆ خەڵکی بەدەر بخات و ئەوە بسەلمێنێ کە جێبەجێ دەکرێت.

## ئایدۆلۆژیا هۆکارێکی ڕێککارییە:

دەتوانرێ لەم خاڵانەی خوارەوە پوخت بکرێ:

١- کاتێ کە ئایدۆلۆژی دەبێتە بیروباوەڕی رامیاری و سەرچاوەی ڕژێمی دەوڵەت ئەوا لە ڕێگای ناساندنی پەیڕەوی کۆمەڵایەتی و رامیاری و دەستنیشانکردنی فەلسەفەکەی دەبێتە ڕێبازێکی دابینکاریی.

٢- هۆكارێكە بۆ ئەوەی كۆمەڵ و تاكەكان بە یەك ببەستێتەوە و كاروبارییان سەبارەت بە ئەركەكان و دەسەڵات و جموجۆڵیان لەناو كۆمەڵگەدا رێكدەخات.

٣- لە قۆناغی خەباتگێڕیدا بۆ سەركەوتنی ئایدۆلۆژی و دامەزراندنی سیستەمێكی نوێ، ئەوا كەسانی لایەنگیر وزۆر لە كەسانی دیكە ملكەچی فەرمانەكانی رابەرانی بزووتنەوەكە دەبن و قوربانی بە گیان خۆیان دەدەن لە پێناوی ئایدۆلۆژیەكە و فەرمانی رابەرانیان بەجێ دێنن.

٤- ئایدۆلۆژییەت یەكگرتنی كۆمەڵگە نوێ دەكاتەوە لە رێگەی نوێكردنەوەی خۆی لە بۆنەكانی نیشتمانییەكاندا.

٥- ئایدۆلۆژیا یارمەتی یەكێتی و یەكگرتنی كۆمەلایەتی دەدات دەرئەنجامێكە بۆ كۆبوونەوەی خەڵك لە چواردەوری دروشم و راگەیاندنەكانی.

## پێنجەم: سەركردایەتی :

**سەركردایەتی:** پێویستییەكی كۆمەلایەتییە بۆ هەموو كۆمەڵگەیەك و هەموو كۆمەڵێك، چونكە نابێ و ناشێ قەوارەی كۆمەڵگەیەك هەروا بەبێ سەرپەرشتی و رێنمایی بەرێوەبچێ و كاروباری بەرێوەببات، جگە لەوەی دادپەروەری دەپارێزی و ماف پاراستن لە ئەستۆ دەگرێت و بەتوندی دژی دوژمنان دەوەستێ.

لەهەمانكاتدا هەر كۆمەڵێك جا گەورە بێ یان بچووك گەر رابەرێكی نەبێ فەرمانیان لەسەر بكات بۆ رێكخستنی ژیانیان ئەوا هەركەسە یان هەر دەستەیەكی نێو كۆمەڵ بە ئارەزووی خۆی رەفتار دەكات و دەستدرێژی دەكەنە سەر یەكتری و ئاژاوە لەناو كۆمەڵگە بلاودەبێتەوە و یاسا و رێساكانی كۆمەڵگە پێشێل دەكەن، هەموو كۆمەڵگەكە دەگرێتەوە، بۆیە سەركردایەتی پێویستییەكی كۆمەلایەتییە دەبێ هەبێ تا ژیانی كۆمەڵگە رێكبخات و فەرمان بەسەریانا بسەپێنێ، وەكو هۆكارێكی دابینكاریی و رێكخستن.

### سەرکردایەتی وەك هۆکارێکی ڕێککاریی :

سەرکردایەتی بەم چەند ڕێگایە دەبێتە شێوازێکی ڕێککاریی:

١- پێشەوایەتی جەماوەر دەکات بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیی و نەتەوایەتییەکان.

٢- ئەو ئامانجە دیاریدەکات کە خەڵکی لە پێناویدا هەوڵدەدەن ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە و دامودەزگاکانی تێدەکۆشن و چالاکییەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە چالاك دەکەن.

٣- توانای هاندانی خەڵك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، ئەویش بەهۆی ئەو لێزانین و کاریگەرییەی لەسەر خەڵك هەیەتی، هەروەها بەکارهێنانی ئەو خۆشەویستی و ڕێزەی لای خەڵك هەیەتی.

٤- سەرکرادیەتی توانای چارەسەرکردنی ناکۆکی و دووبەرەکی نێو خەڵکی هەیە، ئەویش بەهۆی تێگەیشتنی لە کێشەکانی کۆمەڵگە وا لە خەڵکی دەکات کە بە ئاشتیانە مامەڵە لەگەڵ یەکتری بکەن.

٥- ڕەفتاری سەرکردە و هزر و وتەکانیان سەرکردەکان بە درێژایی مێژوو بوونەتە یاسا و ڕەفتاری بنچینەیی کۆمەڵ و زۆر جار دەبێتە ڕێسا و ڕەفتاریان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا.

### شەشەم : ڕای گشتی :

ڕای گشتی هزرێکە لە ئەنجامی گفتوگۆی هۆشیارانەی نێو کۆمەڵێ خەڵك کە بەرژەوەندییەك بە یەکتریان دەبەستێتەوە لە بارەی کێشەیەکی گشتی کە پێکەوە گفتوگۆ دەکەن.

پاش دروستبوونی ڕای گشتی ئەوا دەبێتە هێزێکی کاریگەر و کەسانی سەر بە کۆمەڵ ناتوانن خۆی لێ لابدەن، هەروەها ڕای گشتی جۆرە ڕەفتار و هەڵوێستێك دەسەپێنێ خەڵکی جێبەجێ دەکەن، ئەمەشیان جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕێککاریی.

## ڕەگەزەکانی دروستبوونی ڕای گشتی :

**بنەماکانی ڕای گشتی بریتیین لە :**

أ ـ ڕووداوەکان. ب ـ وتاری سەرکردەکان.

ج ـ هۆکاری چاپکراو د ـ هۆیەکانی ڕاگەیاندنی خوێندراو و بیستراو و بینراو.

هـ ـ فێرکردن. و ـ گفتوگۆ تایبەتییەکان و ڕاگۆڕینەوە.

## ئاستەکانی ڕای گشتی :

**ڕای گشتی سێ ئاستی هەیە :**

١- **ڕای گشتی کپکراو:** ئەمەیان هەیە و ڕاناگەیەنرێت وەك چۆن کۆمەڵێك ڕایەکی گشتی هاوبەشیان هەیە، بەڵام دەرینابڕن.

٢- **ڕای گشتی ئاشکرا:** ئەمەیان وەك بیرۆکەیەك وایە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بەدی بێنی وەك ئەوەی تەنها داوای شتێکی دیاریکراو لە کۆمەڵ یان کۆمەڵگە بکات.

٣- **ڕای گشتی کرداری:** ئەو ڕایە بە وەرگرتنی هەڵوێستێکی کرداری کۆتایی دێت بۆ جێبەجێکردنی بیروڕاکەی.

## پلەکانی بەهێزی ڕای گشتی :

١- **ڕای گشتی دابەشکراو:** ئەمە ئەمجۆرە ڕایە دەگرێتەوە کە کۆمەڵگە دابەش دەبێت بەسەر دوو بۆچوون، هەریەکەیان ڕایەکی تایبەتی هەیە. لێك جیاوازن.

٢- **ڕای گشتی ئاسایی:** ژمارەیەکی زۆر خەڵك لەسەری ڕێکدەکەون.

٣- **ڕای گشتی ڕاستەقینە:** هەمووان لەسەر یەك بیروڕان و ئەمەش باڵاترین پلەی ڕای گشتییە.

## ڕای گشتی وەکو شێوازێکی ڕێککاری:

ئەمەشیان لەم چەند لایەنە سەرەرکییانەدا بەدیار دەکەون:

١- ڕای گشتی توانایەکی مەزن هەیە لە کاتی کێشە و تەنگوچەڵەمە و لەکاتی شەڕ یان بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکی کوشندە یان کارەساتێك کە ڕوو دەدات و کاتیَ ڕای گشتی هەڵوێستێك دەگرێتە بەر، هەمووان دەبیَ پەیڕەوی بکەن.

٢- ڕای گشتی دابونەریتێکە بەرە بەرە دروست دەبێت و بە توندی هەڕەشە لە تێکدەرانیان دەکات بۆیە هۆکارێکە بۆ پاراستنی.

٣- ڕای گشتی چاودێری ئەرکەکانی لە دەسەڵات دەکات کە ئەمەیان گەورەترین شێوازی دابینکارییە.

٤- ڕای گشتی هەڵوێستی کەسان بە گوێرەی پێداویستییەکانی گۆڕانکاری کۆمەڵ ڕێکدەخات.

## حەوتەم: پڕوپاگەندە (الدعاية):

پڕوپاگەندە چەند هەڵوێستێکی ڕەفتاری دروست دەکات، وادەکات ڕەفتاری خەڵك بەهەندیَ ڕێسا و هەڵوێستە دروستکراوەکە پابەند بن.. پڕوپاگەندە لە هەموو کاتێکدا خراپ نییە وەکو باسی دەکریَ، بەڵکو خزمەتێکی چاکی بەرژەوەندی ئابووری وڵات لە دەرەوە و ناوەوە دەکات و خزمەتی وڵات دەکات لە باری نائاساییدا پشتگیری بۆ بەها و دابونەریتەکان بەدی دێنیَ، پڕوپاگەندەش لەوانەیە ڕامیاری یان ئابووری یان هی شەڕ بیَ یاخود کۆمەڵایەتی بیَ.

## پڕوپاگەندە وەك هۆكارێكی رێككاریی :

دەتوانرێ بەم خاڵانە ڕوون بكرێتەوە:

١- رێنمـایی خـەڵكی دەكـات بـۆ پـەیڕەوكردنی رەفتـارێكی دیـاریكراو، رەفتارێـك قەدەغە دەكات.

٢- دەوڵـەت پڕوپاگەنـدە بـەكاردێنیٚ بـۆ كاریگـەری لەسـەر رای گـشتی لـەپێناو بەرژەوەندی گشتیدا بۆ ئەوەی بەرژەوەندی گشتی كۆیان بكاتەوە.

٣- دەوڵــەت بــەكاری دێنێــت بــۆ بڵاوكردنــەوەی فەلــسەفەی رامیــاری و كۆمەڵایەتییەكەی .

٤- ئەو دابونـەریت و شـێواز و رەفتارانـەی لـە كۆمەڵگـە هەیـە لـەخۆ دەگرێت لـە رێگای پەرتووك و تەلەفزیۆن و رۆژنامە بڵاودەكاتەوە.

## هەشتەم: هۆكارەكانی دیكەی رێككاریی :

هەندیٚ لە هۆكاری دیكەی دابینكاریی لە كۆمەڵگەدا هەن باسین لیٚ نەكراوە وەك رێگەكانی ڕێگە میللیەكان (چۆنێتی خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و چۆنێتی سلاٚوكردن و دابونەریتی دیكە). ئەم رێگە میللیانەش شێوەی نەریتێك بەخۆوە دەبینیٚ و ئەم نەریتانە زیاتر دیار و ئاشكران و سزای تێدا ئاشكرایە و هەندیٚ لە هـۆز و تـیرە ئاینییـەكان دوورخـستنەوەی كۆمەڵایـەتی وەك سـزایەك پـەیڕەو دەكەن، كەسان لە كۆمەڵگە دەردەكەن و بێبەشـیان دەكـەن لـە مامەڵـەكردن و پەیوەندی لەگەڵیاندا قەدەغە دەكەن.

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

پ١/ مەبەست لە ڕێککاریی کۆمەڵایەتی چییە و چەند پێناسەی جیاوازی هەیە؟

پ٢/ گرنگی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی چییە؟

پ٣/ چەند ڕێبازێك بۆ مەشق و ڕاهاتن هەن، سرووشتی ڕێبازەکانی دیاربکە؟

پ٤/ کۆمەڵگە پەنا دەباتە بەر چەند ڕێگایەك بۆ مەشق و ڕاهاتن... باسیان بکە؟

پ٥/ بۆچی هەندێ جار کۆمەڵگە پەنا دەباتە بەر گوشار و پەرچدانەوە بۆ ڕێککاریی کۆمەڵایەتی و ڕێبازەکانی ئەم ڕەفتارە دیاری بکە؟

پ٦/ چۆن دەوڵەت وەك شێوازێکی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی ڕۆڵی خۆی دەبینێت؟

پ٧/ ڕۆڵی ئایین لە ڕێککاریی کۆمەڵایەتی باس بکە؟

پ٨/ مەبەست لە ئایدۆلۆژی چییە و چۆن وەك شێوازێکی دابینکردنی کۆمەڵگە کاردەکات؟

پ٩/ چۆن سەرکردایەتی دەبێتە شێوازێکی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی؟

پ١٠/ ئەمانەی خوارەوە ڕوون بکەرەوە:

١- ئاستەکانی ڕای گشتی.

٢- پلەکانی بە هێزی ڕای گشتی.

٣- ڕۆڵی ڕای گشتی وەك شێوازێکی ڕێککاریی.

پ١١/ چۆن پڕوپاگەندە دەبێتە شێوازێکی ڕێککاریی کۆمەڵایەتی؟ باسی بکە.

# گۆڕانی کۆمەڵایەتی

دەتوانین **گۆڕانی کۆمەڵایەتی** پێناسە بکەین بەوەی ( ئەو گۆڕانە لەخۆوە یان نەخشە بۆ کێشراوەیە کە بەسەر ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگەدا دێت وەك (دەزگاکانی ئابووری و دەزگاکانی بیروباوەڕ و نموونەیی و زانستی ) . دەزگاکانی کۆمەڵیش لە شێوەیەکی ساکارەوە بۆ شێوەیەکی ئالۆزی تێکچڕژاو کە بەپێی خواستەکانی کۆمەڵ و سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئامانجەکانی بگونجێت.

**پێناسەیەکی دیکەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی**:( بریتییە لە کودەتایەك (هەڵگەڕانەوەیك) بەسەر بونیادی کۆمەڵگەدا، ئەم کۆمەڵگە لە قۆناغێکی دواکەوتووی شارستانێتییەوە بەرەو قۆناغێکی شارستانێتی پێشکەوتووی بالاتر دەبات.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا کۆمەڵناسی بایەخی بە لێکۆڵینەوەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی داوە. کاتێ (ئۆگست کۆنت و هربرت سبنسر) وچەندانی دیکەش هەڵسان بە شیکردنەوەی هۆیەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و دەرئەنجامەکانی لە میانەی ڕووداوەکانی شۆڕشی رامیاری و پیشەسازییەکانیان دەکۆڵیەوە، ئەو شۆڕشانەی کە لە کیشوەری ئەورووپادا سەریان هەڵداوە بە تایبەتیش شۆڕشە رامیارییەکەی فەرەنسا و شۆڕشە پیشەسازییەکەی ئینگلتەرا.

ئەم شۆڕشانە بوونە هۆی گۆڕانکارییەکی روون و ئاشکرای رژێمی حوکمڕانیەتی وبیروباوەڕەکانی بیرکردنەوەی گەلان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و ئاستی گوزەران و شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی، بۆیە گرنگ بوو بیردۆزەیەکی تایبەت بە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵایەتی بێتە کایەوە و کاری شیکردنەوەی یاساکانی بزووتنەوەی کۆمەڵگە و رێبازەکەی بگرێتە ئەستۆ و قۆناغەکانی مێژووی شارستانێتی کە کۆمەڵان پێیدا تێدەپەڕێ دەستنیشان بکات، و شێوە و کێشەکانی هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوو و پەیوەندی بە لایەنی ماددی و گیانی دیاردەکانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی دیاری بکات.

## شێوەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی :

بابەتی شێوەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی پەیوەستە بە بابەتی ڕەوت و ئامانجەکانی گۆڕانکارییەکەوە هەیە، گۆڕان بەیەك شێوازی تایبەت ناڕوات هەرچەندە ئامانج و ژینگەکە جیاواز بێت. دەتوانین گۆڕانکاری بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن بکەین:

### ١- گۆڕانی کۆمەڵایەتی بازنەیی:

بیرۆکەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بازنەیی کۆمەڵێك وەرگیراو لەخۆدەگرێ، وای بۆ دەچێ کە دیاردەکانی کۆمەڵایەتی هەر جۆر و شێوەیەکی هەبێ، ماوە نا ماوە دووبارە دەبێتەوە و دووبارەبوونەوەکەش پشت بەو بارە بابەتییەی و خۆیەتییەی کە کۆمەڵگەکان پێی تێپەڕدەبن دەبەستێ.

جاری وا هەیە کۆمەڵگەکان بە ماوەیەکی وەستان و دواکەوتن تێدەپەڕێ و ئینجا بەرەو پەرەسەندن و بوژاندنەوە و گەشەپێدان دەڕوات. دواتر ئەو ماوەیە بەردەوام نابێ و سەرلەنوێ دووچاری دواکەوتن و ئاژاوە و ناسەقامگیری دەبنەوە.

ئەم بیردۆزە سەرەتا لای گریکییەکان سەریهەڵداوە و شارستانی خۆیان بە شارستانێتییەکی بێ هاوتا و نایاب دادەنا کە جیاوازی لەگەڵ هەموو شارستانیەتەکانی دیکە هەبوو کە گەیشتبووە ئەوپەڕی پێگەیشتن. فەیلەسووفانی ئەغریقی لەو باوەڕدا بوون کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەگۆڕێت، بەڵام گۆڕانکاری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەرەو دابڕان و هەڵوەشانەوە و لێکترازان دەبات، پاش ئەوەی بە چوار قۆناغ تێدەپەڕن بەوەی کە کۆمەڵگەکان لە چەرخی زێرینەوە بەرەو چەرخی زیوین دەچن، دوایش دەچنە نێو چەرخی مسییەوە تا ئەنجام خۆیان لە چەرخی ئاسنین دەبیننەوە.

ئەم بیردۆزە جەخت لەسەر بیرۆکەی بەیەکچوواندنی بوونەوەری کۆمەڵایەتی لەگەڵ بوونەوەری ئاژەڵی دەکات لە لایەنی چۆنیەتی پەیدابوون و پێگەیشتن وەك چۆن مرۆڤ لە دایك دەبێت و گەورە بوون و پاشان پیربوون... ئەوا کۆمەڵگەیش هەروا بەهەمان قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ تێدەپەڕێت، بەم پێوانەیە باوەڕێك دروست دەبێت بەوەی کۆمەڵگە دەکات کە بەهێڵێکی بازنەییدا دەڕوات.

## ٢- گۆڕانکاریی ئاسۆیی یان درێژی:

ئەم بیردۆزە لەو بڕوایە دایە کە هەموو دیاردەکان و کردەوە و پێڕەوەکانی کۆمەڵگە بە بەردەوامی دەگۆڕێن و گۆڕانکارییەکەش بەرەو ئامانج و خواستێکی دیاریکراو دەبێت و رووداوەکانی رابردووش تیایدا دووبارە نابێتەوە، بەڵکو کۆمەڵگە بەرەو قۆناغێکی بالاو پێشکەوتووی بەرزتر و کاریگەر و توانادار دەچێت و ئاواتەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگە وەدەست دێنێ.

ئەم بیردۆزە لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەریهەڵداوە و دەیویست ئاراستەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی دیاری بکات، بڕوای وابوو کە ئاراستەیەکی پێشکەوتوو لە هەموو بارودۆخێکدا هەنگاو دەنێت، هەروەها دەزگا و رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان کە بونیادی کۆمەڵایەتییان پێکهێناوە بە شێوەیەکی ساکارەوە دەستپێدەکات و پاشان گەشە دەسێنێ و ئاڵۆز و ورد دەبێت و بنەما گشتییەکانی بۆ روونکردنەوەی تایبەتی دابەش دەبێ، بیردۆزە هەیە لەو بڕوایەدایە کە پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتیش بە زنجیرە قۆناغێك تێدەپەڕێت و ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هەموو دیاردەکانی کۆمەڵایەتی ئەم زنجیرەیە پەیڕەو دەکات لە گۆڕانکارییەکانیدا.

### ٣- گۆڕانی بڵاوبوونەوەی شارستانێتی:

بڵاوبوونەوە بریتییە لە گواستنەوەی پێکهاتەکانی شارستانیەتی لە نیشتمانی ڕەسەنەوە بۆ کۆمەڵگەکانی دیکە، کە بەشێوەیەك لە شێوەکان دایدەڕێژێت و کاریگەری کۆمەڵایەتی لە شێوەکان باوەشی پێوەدەگرن بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی و شارستانێتی و تەکنەلۆژیای لەسەر دروست دەکات.

بڵاوبوونەوە بنچینەی بنەڕەتییە لە گۆڕانکاری شارستانێتی لە هەموو کۆمەڵگەکاندا، بڵاوبوونەوە ڕۆڵێکی گەورەی بەسەر خێرایی گۆڕانی کۆمەڵگەکان هەیە. گەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کۆن بە شێوەیەکی تەواو دابڕاو لە یەکتری ژیا بان، ئەوا هەرگیز نەیاندەتوانی بیر و زانیاری و داهێنان ئاڵوگۆڕ بکەن، ئەوا هەر لە ئاستێکی دواکەوتووی کۆمەڵایەتی و زانیاری و ماددی دەمانەوە.

هەندێ لە زانایان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە تەنها یەك شارستانیەتی ڕەسەن هەبووە و بە درێژایی کات بۆتە سەرچاوەی شارستانێتی کۆمەڵگەکانی دی، شارستانێتی دۆڵی ڕافیدەین سەرچاوەی شارستانێتیی بووە و بۆ گەلانی دیکە گواستراوەتەوە و بۆتە هۆی دروستبوونی شارستانیەتی هاوشێوەی دۆڵی ڕافیدەین یان لەوان پێشکەوتووتر.

هەروەها ئەو زانایانە دەڵێن کۆمەڵگەکانی کۆنی کشتوکاڵی کە دەکەوێتە دەرەوەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆن، هەمان تایبەتمەندی شارستانیەتی دۆڵی ڕافیدەینی هەبووە لەسەردەمی حامۆڕابیدا هەمان شێوازی شارستانێیەتی لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی شارستانیەتیەوە بۆ سەرانسەری جیهان گواستراوەتەوە.

## ٤- گۆڕانی کۆمەڵایەتی پەرەسەندوو:

سەدەی نۆدەهەم پاش سەرهەڵدانی کتێبەکەی داروین لەژێر ناوی (ڕەچەڵەکی چەشنەکان) واباو بوو کە گۆڕانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکەوێتە ژێر یاسای گەشەسەندن، ئەو یاسایە وا لە بزووتنەوەی گۆڕانکاری دەکات بە چەند قۆناغێکی گەشەسەندنی یەك بەدوای یەکی جیاوازی پلەداری یەك بەدوایەکی ئاڵۆز تێبپەڕێ، لە ساکارەوە بەرەو ئاڵۆزی لە نزمییەوە بۆ لوتکە ئەم ڕەوتە لە سەدەی نۆزدەهەمدا ناونرا بە ئاراستەی یەك گەشەسەندی درێژەدار. واتا پابەندبوون بەمە ئەوە دەگەیەنێ کە قۆناغەکانی گەشەسەندن بە هەمان شێوەیە لە بارەی ژمارە و دووبارەبییەك لە مێژووی گەشەسەندن لە هەموو نەتەوە و کۆمەڵێك.

زانای فەرەنسایی **سانت سیمۆن** بڕوای وایە ئەو قۆناغانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی پێیدا تێدەپەڕێ، سێ قۆناغی **هۆشمەندییە**: قۆناغی **هەڵسەنگاندن** و نیمچە **هەڵسەنگاندن** و قۆناغی بابەتییە.

**ئۆگست کۆنت** بە بیروباوەڕەکانی سانت سیمۆن کاریگەر بووە ، ئەویش وای بۆ چووە گەشەسەندن بە سێ قۆناغ تێدەپەڕێ: قۆناغی ئایینی لاهوتی و قۆناغی فەلسەفیی و دوا قۆناغیش قۆناغی زانستی واقیعییەت. کۆنت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە **قۆناغی یەکەم** دەکەوێتە بەر کاریگەری هێزی لاشەیی چەسپاو و بێگیانەکان. **قۆناغی دووەم** قۆناغێکی گۆڕانی بیری ئاشکرا و ڕوون ناسراوە، واتە پاش ئەوەی مرۆڤ باوەڕی بەهێزی بێگیان هەبوو، ئینجا ڕووی کردۆتە هێزە زیندووەکان و ئەو بیرو باوەڕانەی کە ناوەڕۆکی شتەکان و هێزیان لێك دەداتەوە. **قۆناغی سێیەم** بە قۆناغێکی بیرکردنەوەی زانیاری بە ژیربێژی (منطقي) هاوسەنگە، هەروەها کۆنت وای بۆ دەچوو کە هەر گۆڕانکارییەك لە بەشێك لە بەشەکانی کۆمەڵگە ڕوودەدات، ئەوا پێویستە بەشەکانی دیکەش

دەکەونە بەر کاریگەرییەوە، کەواتە لەوێڕاو لە هەموو کۆمەڵاندا پەیوەندی لە نێوان بارودۆخی مادی و ڕەوشتی و ڕامیاری هەموو کۆمەڵگەکان هەیە، بە تایبەتی کاتێ ئەم کۆمەڵگانە بە هەمان قۆناغەکانی مێژووی شارستانێتی تێبپەڕن، هەروەها سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانی سەرەتای هاوچەرخ لە سیستەمی کۆمەڵگەی هاوچەرخ دەچێت.

## ٥- گۆڕانی کۆمەڵایەتی نەخشەدار:

گۆڕانکاری نەخشە بۆ کێشراوە بریتییە لەو جۆرە گۆڕانەی کە لەگەڵ بنەمای دەستێوەردانی دەوڵەتە بۆ ڕێکخستنی نەخشەدانانی کاروباری کۆمەڵگە، ئەوەش لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی بگونجێت. کۆمەڵگە لە ڕێگەی دەوڵەتەوە پێویستە ئامانج و بەرنامە و پرۆژەی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بۆ کۆمەڵ دابین بکات، تا گەشەسەندنی داواکراو بەدی بهێنێ، بەڵام ناتوانێ کۆمەڵگە ئامانجەکانی بەدی بهێنێ بەبێ پەیڕەوکردنی ڕێگا و شێوازی ڕاپەڕاندن کەلە ڕێگەیەوە دەتوانێ ئامانج و مەبەستەکانی بەدەست بێنێ، وا دەکات لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی دیکە بگۆڕێت کە بە ئاستێکی باڵاترەوە دەگۆڕێت و پلە و پایە بەرزتر دەبێت.

ئەمجۆرە گۆڕانکارییە نەخشە بۆ کێشراوە لە هەموو کۆمەڵگەکاندا ڕوودەدات و جۆری سیستەمەکەی هەرچۆنێك بێت، ئەوە لە کۆمەڵگەکانی سەرمایەدار و سۆشیالیستییەکان هەیە بەم گۆڕانکارییە تێدەپەڕێت و هەرچەندە ئەمەی دوایی لە گەشەسەندنی گۆڕانکاری زیاتر پشت بە نەخشەکێشانی ناوەندی دەبەستێت لە کۆمەڵگە سەرمایەداریدا دەوڵەتانی سۆسیالیستی نەخشە بۆ هەموو کەرتەکانی کۆمەڵگە دەکێشێت و سەرپەرشتی دەکات و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەست لە کاروباری کەسان وەردەدات و سەرپەرشتی بەرنامە و

ڕێکخستنی دەکات، کەچی دەوڵەتانی سەرمایەدار دەستکاری تەنها لە کێشە گرنگ و ترسناکەکان دەکات و نەخشە و پلانیان بۆ دەکێشێت و سەرپەرشتی جێبەجێکردنی دەکات، ئەگینا بەهیچ شێوەیەك دەست وەرناداتە کاروباری کەسان و تێکەڵاوی نەخشەکانیان نابێت و بە سەربەستی کاردەکەن و کاروباری مادی و نامادی بەخۆیان بەڕێوە دەبەن.

یەکەمین کەس کە ئەمجۆرە گۆڕانکارییەی دەستنیشان کردووە، کۆمەڵناسی (فرانك وورد) بووە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتایی سەدەی بیستەم ناوبانگی دەرکردووە و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ڕاست نییە بڵێین گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی شتێکی کتوپڕە و لە خۆیەوە ڕوودەدات و ناتوانرێ دەستی بەسەردا بگیرێ، یان دەستنیشان بکرێت، بەڵکو گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ پێشوەخت نەخشە بۆ پێشبینی و پێشەکی کار و کاردانەوە و ئاکامەکانی بکرێت و دەتوانرێ دەست بەسەر ڕەوتی بگیرێت و ئەو ڕێگە و شێوازانە دیاری بکرێ کە بەرنامە و ئامانجەکانی بەدی دێنێت.

## هۆکارەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی :

دیاردەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی لە گشت کۆمەڵگەکاندا هەیە ئەم دیاردەیەش چەند هۆکارێکی بابەتیی هەیە دەتوانرێ بۆ سێ جۆر پۆلین بکرێت:

### ١- هۆکارە سروشتییەکان :

مرۆڤ لە هەر شوێنێکدا بژی هەوڵدەدات خۆی لەگەڵ ژینگە و سرووشتدا بگوجێنێت، زەوی بکێڵێت و جۆگە دروست بکات و کشتوکاڵ بچێنێت، لە چاندنیش هەر چوار وەرزی ساڵ ڕەچاو بکات و بە دوای کانەکانی نێو زەوی بگەڕێت، ئەمانە هەمووی گۆڕانکارییە مرۆڤ خۆی دروستی دەکات لەم

گۆڕانکارییانەدا مرۆڤ دەبێ زنجیرە پەیوەندییەکی مرۆڤایەتی و هاریکاری بە کەسانی دیکەوە ببەستێ و مرۆڤ بەردەوام گۆڕانکاری بە خۆوە دەبینێ، چونکە کۆمەڵان ئاوات و ئامانجی تازە بۆ جێبەجێکردنی رەچاو دەکەن.

بەڵام جاری وا هەیە سرووشت گۆڕانی بەسەردا دێت و بە پێچەوانەی خواستەوە دەبێت و بای توندوتیژ هەڵدەکات یان لافاو و زەمینلەرزە روودەدات و باری ژیان و هێمی مرۆڤ لەق دەکات وایلێدەکات کاری زیاتر وەك کاردانەوەیەك بە رووی ئەم کارەساتانەوە بکات.

هەندێ جار مرۆڤ کەمتەرخەمی لە چاندنی زەویوزاری دەکات و زەوییەکە بە پیت نابێت و ناچار بەجێی دەهێڵێی و بەرەو زەویوزارێکی دیکە دەڕوات، بەمەش جۆری کار و شێوازەکانی بەروبووم دەگۆڕێت و ئەمجۆرە گۆڕانکارییە لە کۆمەڵگەدا دەنگ دەداتەوە.

## ٢- هۆکاری پیشەسازی و تەکنەلۆژی:

شۆڕشی پیشەسازی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیی گەورەی بەرپاکرد و رژێمی دەسەڵاتدار و پرۆگرامەکانی خوێندن و باری ئابووری و قەوارەی خێزانی گرتەوە و بووە هۆی پەیدابوونی سەندیکای کرێکاران و هی ئەندازیاران و...تاد. هەروەها بووە هۆی لەناوچوونی کۆمەڵانی بچووك و کۆمەڵی سەرەتایی.

بەردەوام پیشەسازی پێشدەکەوێ و گەیشتە رادەیەك تەقینەوەی ئەتۆمی ئەنجام بدرێت و لە ئاسمان بکۆڵنەوە و بگەنە سەر مانگ.

بۆ نموونە تەلەفزیۆن و سەتەلایت دەنگوباسی سەرانسەری جیهان بۆ خێزان دابیندەکات و جیهانی وەك گوندێکی بچووك لێکردووە و دەتوانرێ بە یەك چرکە رووداوەکانی جیهان بزانرێ و بلاوبێتەوە. ئۆتۆمبیل و فڕۆکە کۆمەڵانی دابڕاوی بە یەك گەیاندن بە کۆمەڵانی دیکەشی بەستنەوە، جگە لەوەی کە مۆبایلیش

پەیوەندییەکانی ئاسانتر کرد، رادەی بەروبووم زیادی کرد و باری گوزەران بەرەو چاکتر چوو.

شارەکان تا دەهاتن گەورەتر بوون و کۆچ بەرەو شارەکان زیاتر دەکرا و هەر دیاردەیەك لەم دیاردانە کاردانەوەی بۆ سەر پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتییەوە هەبووە کە بنەمای کۆمەڵایەتی لێ پێکهاتووە، ئەم پەیوەندییانەش لە ئاستێك بۆ ئاستێکی دیکە گەشەیان سەندووە و گۆڕاوون.

## ٣- هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان:

ئەم هۆیانە پەیوەندییان بە گۆڕانکارییەکانی بنەما و پێکهاتەکانی کۆمەڵگە هەیە و کۆمەڵگە هەروەکو چۆن کۆمەڵناسی باسی دەکەن لە چەند دەزگایەکی سەرەکی پێکهاتووە و هەریەکە فەرمان و ئەرکی دیاریکراوی خۆی هەیە وەك دەزگاکانی رامیاری و ئابووری و ئایینی پەروەردەیی و سەربازی، ئەم دەزگایانە پەیوەندییان بەیەکترییەوە هەیە و تەواوکەری یەکترین و هەر گۆڕانکارییەك لەهەر یەکێکیان روویدات، ئەوا کاردەکاتە سەر دەزگاکانی دیکە، بەمەش پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دیکە دەگۆڕێت، گەر بێتو دەزگاکانی ئابووری پشتبەستوو بە پیشەی کشتوکاڵ و چاندن بگۆڕێ بە پیشەسازی و بازرگانییەتی و شێوازەکانی بەرهەمهێنان لە شێوازی دواکەوتووی پەککەوتوو بۆ شێوازی پێشکەوتووی دینامیکی، ئەم گۆڕانکارییەش کاری لە رژێمی خێزان و پەروەردە و سیستەمەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی کردووە خێزانی زۆر ئەندام بۆ خێزانی بچووك و کەمئەندام گۆڕاوە.

## ئەنجامەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی:

ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر کۆمەڵگەدا دێن کاردانەوەی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەسەر تاکەکەس و دەستە و کۆمەڵگەکان دەبێت، دەتوانین ئەنجامەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی بەم چەند خاڵانە دەستنیشان بکەین:

١- گۆڕینی پیشەی کۆمەڵگە لە پیشەی شوانییەتی یان کشتوکاڵی و چاندن بۆ پیشەی بازرگانییەتی یان پیشەسازی.

٢- بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەرانی تاکە کەسان و کۆمەڵ بەتایبەتی پاش گۆڕانی کۆمەڵگە لە کشتوکاڵییەوە بۆ پیشەسازی . بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەران دەبێتە هۆی زیادبوونی بەروبووم توانا‌داری تاکەکەسان بۆ کڕین، ئەوەش لە ئەنجامی داهاتی تاکەکەسان و بەرزبوونەوەی نرخی و بەهای شتەکان دێتەدی.

٣- تایبەتمەندی و دابەشکردنی کار سەرهەڵدەدات، ئەم ڕێبازە دەبێتە مایەی زیاد بوونی بەروبووم و باشی جۆرەکەی و بەسەر چەند لقێکی بەرهەمداری و کارگوزاری نێو کۆمەڵگە.

٤- بەکارهێنانی دەزگا و ئامێری تەکنەلۆژیا لە کاری بەرهەمهێنانی و کارگێڕیەتی گشتییدا، هەرچەند ئەم ئامێرانە پێویستیان بە مەشق و راهێنانی زانیاری و تەکنەلۆژیا هەیە.

٤- بەها و رەفتارەکانی کۆمەڵایەتی لە بەهایەکی خۆیەتی و هەڵچوون و کەسایەتییەوە بۆ بەهای بابەتی و ژیرایەتی و کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت.

٥- خێزان لە قەوارەیەکی گەورە و ئەندامان زۆرەوە بۆ خێزانێکی ناوەکی قەبارە بچووک دەگۆڕێت، شێوازی هاوسەرگیری لە فرە ژنی بۆ تاکە ژنی دەگۆڕێت، جگە لەوەش دەبێتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییەکانی خزمایەتی و دۆستایەتی.

٦- بەهۆی ئاڵۆزیەتی و بەشبەشبوونی کۆمەڵ و زۆری گوشار و فشاری سەر تاکەکەس کێشەکانی کۆمەڵایەتی تەشەنە دەکات و پاشماوەکەی بەسەر کەس و کۆمەڵگە دیار دەبێت.

٧- خێرایی گۆڕانی باری ماددی و سستی گۆڕانکارییەکانی نموونەیی دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان دەبێتە مایەی سستی هەنگاوەکانی شارستانێتی، ئەمەشیان هۆی سەرەکی کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایانەن کە دووچاری گۆڕانکاری دەبنەوە.

٨- گۆڕانی سیستەمی رامیاری لە رژێمی دەسەڵاتداریەتی تاکڕەوی کە لەسەر ستەمکاری توندڕەوی و خۆپەرستی دامەزرابوو، بۆ رژێمێکی دیموکراتی باوەڕی بە دادوەری کۆمەڵایەتی و سەربەستی و یەکسانی هەبێ.

٩- ئازادبوونی ئافرەت شکاندانی کۆت و بەندە کۆمەڵایەتییانەی کە بەسەریاندا سەپێنرا بوو، هەروەها یەکسانبوونیشیان لەگەڵ پیاواندا لە بارەی ماف و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکاندا و بەشداریکردنیان لە بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیان شان بە شانی پیاوان.

## تیۆرەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی:

گرنگترین بیردۆزەکانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی ئەمانەن:

**١- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن فارابییەوە.**

**٢- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن ئیبن خەلدوون.**

**٣- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن ئەمیل دۆرکهایم.**

**٤- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن ئۆکبرین.**

واتە لە خوارەوەش بە درێژی لەم بیردۆزانە دەکۆڵێتەوە:

### ١- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن فارابییەوە:

گـــۆڕانی کۆمەڵایـــەتی لای فـــارابی (شـــتێکی مـــسۆگەرە و بەبەردەوامیـــەتی و کاریگەری) ناسراون، وای بۆ دەچێ کە کۆمەڵگەکان لـە کۆمەڵگـەی ناتـەواوە بـۆ کۆمەڵگـەی تـەواو دەگـۆڕێن و کۆمەڵگـە تـەواوەکان لـە کۆمەڵگـەی بـچووکەوە دەگۆڕێن بۆ کۆمەڵگەی مامناوەند و ئینجا بۆ کۆمەڵگەی گەورە دەگۆڕێن.

کۆمەڵگەی بچووکیش بریتیین لە کۆبوونەوەی خەڵکی شار کە بەشێکن لە نەتـەوە و دەکەونە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکێك، کۆمەڵگەکانی مامناوەندیش بریتیین لە کـۆی نەتـەوە لـە بەشـێکی ئـاوەدان لـەژێر سـایەی حکوومـەتێکی سـەربەخۆدا تیایـدا دەسەڵات دەگێڕێـت و کۆمەڵگـەکانی گـەورەش کـۆی جیهانـە بـە گـشتی لـە یـەك دەوڵەتدا و لەژێر دەسەڵاتداریەتی یەك حکوومەتدایە.

کۆمەڵگە ناتەواوەکان لە کۆمەڵگەی خێزانەوە دەگـۆڕێن بـۆ کۆمەڵگـەی گـەڕەك و پاشـــان بـــۆ کۆمەڵگـــەی لادێ. کۆمەڵگـــەی خێـــزان بریتییـــە لـــە کۆبوونـــەوەی ئەندامەکانی خێزان لە یەك ماڵ و کۆمەڵگەی گەڕەکیش کۆی چـەند خێزانێکـە لـە یـەك شـوێندا، کۆمەڵگـەی لادێـش کۆبوونـەوەی چـەند گەڕەکێکـە لـە سـنووری گوندێکی دیاریکراودا. هەروەکو فارابی پێی وایـە کۆمەڵگـەی ناتـەواو بـە درێـژایی مێژوو دەبنە کۆمەڵگەیەکی تەواو هۆی گۆڕانکارییەکەش.

### ٢- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لای ئیبن خەلدوون:

ئیبن خەلدوون ناودارترین زانای کۆمەڵناسـیە کـە گـۆڕان بـە کـارێکی (حـەتمی) کۆمەڵگە دادەنێت، لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی دیکە، بە لای ئەو کۆمەڵگەی بـە بوونەوەرێکی زیندوو دەچوێنێ، چونکە لە دایك دەبێ و گەشەدەکات و گـەورە دەبێ و دوایی بێهێز دەبێت و دەمرێت، وای بـۆ دەچـێ کـە کۆمەڵگـە بـە سـێ قۆناغ گۆڕانکار سەرەکی تێدەپەڕێت:

١- قۆناغی کۆچەریی.

٢- قۆناغی لادێیی.

٣- قۆناغی شارنشینی.

ئیبن خەلدوون بڕوای وابوو هۆکاری بزووتنەوەی کۆمەڵگە و ڕاگواستنی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە بۆ لاوازیەتی هاریکاری نێوان ئەندامانی و نەبوونی خۆشی و دڵنیایی لە چوارچێوەیەکدا خەڵکی ناتوانن بەرگری لە بوونی خۆیان بکەن، لەم بارەدا کۆمەڵگە دووچاری دوژمنکاری و داگیرکردن دەبێتەوە و کۆمەڵگە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دیکە دەگۆڕێت و ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو حالەتەی بەسەردا دێت بریتییە لە کۆمەڵگەی شارنشینی ئەو کۆمەڵگەیە کە بەردەوام لە ناکۆکییدایە لەگەڵ کۆمەڵگەکانی کۆچەکەرانی دەوروبەری.. کەواتە لاوازیەتی هاریکاری و ناتەبایی نێوان شارنشینی و کۆچکەران زیاتر دەکات، ئەمەشیان لەلای ئیبن خەلدوون بنچینەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییە.

ئیبن خەلدوون لەو بڕوایە دایە کۆمەڵگە لە شێوەیەك بۆ شێوەیەکی دەگۆڕێت و بە قۆناغەکانی شارستانیەتی جیاواز تێدەپەڕێت، هەروەکو چۆن زیندەوەری گیانلەبەر لە ژیانیدا پێی تێدەپەڕێت و کۆمەڵگە وەکو منداڵ لە دایك دەبێ و گەشە دەکات و بەهێز دەبێ و دوابەدوای ئەوەوە لەناو دەچێت و ئەم گۆڕانکارییەش کارێکی سرووشتی و پێویستە ڕوودەدات و ناتوانرێ قەدەغە بکرێت و بەبەردەوام گۆڕان یاسایەکی مێژوویی دادەنرێت و کۆمەڵگە بە پێیەوە بە سێ قۆناغ تێدەپەڕی:

١- ماوەی نەشونما و پێگەیاندن.

٢- ماوەی پێگەیشتن و تەواوبوون.

٣- ماوەی پیرییەتی و لەناوچوون.

گۆڕانکاری بەپێی بیروبۆچوونی ئیبن خەلدوون گۆڕانێکی بازنەییە و بە هێڵێکی ڕاستدا و ئاسۆییدا تێناپەڕێت، بەڵکو بەشێوەیەکی بازنەیی دەسوڕێتەوە. هەروەها وای دەبینیٚ کە قۆناغی یەکەم قۆناغی کۆچەرییە و ئەمان جێنشین دەبن و دەبن بە کۆمەڵگەی شارستانیەتی و ئەمەی دوای لەبەر دووبەرەکی و ناکۆکی لەگەڵ کۆچەران لێکهەڵدەوەشێتەوە و لەناو دەچێت.

## ٣- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لای ئەمیل دۆرکهایم :

ئەم بیردۆزە کۆمەڵگەکان دەکات بە دوو بەشی سەرەکی کۆمەڵگەی میکانیکی و کۆمەڵگەی ئەندامیەتییە. مەبەست لە کۆمەڵگەی میکانیکی کۆمەڵگەی ساکارە و ڕژێمی کار تیایدا دابەش ناکرێت و تایبەتمەندی لە کاردا تیایدا نییە، کەچی کۆمەڵگەی ئەندامیەتی کۆمەڵگەیەکی ئاڵۆزی تایبەتمەندە و کار تیایدا دابەش دەکرێت.

دۆرکهایم بەپێی سرووشتی وابەستەی کۆمەڵایەتی داسەپاو کۆمەڵگەکان دەکات بە دوو بەشەوە (وابەستەی میکانیکی و وابەستەی ئەندامیەتی) بەشێکیان تایبەتمەند و ئاڵۆزە و ئەوی دیکە کۆمەڵگەیەکی ناتایبەتمەندی ساکارە. کۆمەڵگە لە کۆمەڵگەی میکانیکییەوە دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵگەی ئەندامیەتی.

**دۆرکهایم دەڵێت:** کە کۆمەڵی ساکار بە دەستەیەك دەست دەستپێدەکات و دەبیٚ بە عەشیرەتێك دوابەدوا دەبێت بە هۆز و ئەمان هەموویان کۆمەڵگەی ساکارن و پشت بە دابەشکردنی کارو تایبەتمەندی نابەستن.

کۆمەڵگەکانی ئاڵۆز و تایبەتمەند کۆمەڵگەی فراوان و ئاڵۆزن و پشت بە دابەشکردنی کار دەبەستن و نموونەی ئەمجۆرە کۆمەڵانە خۆی لە کۆمەڵگەی شارەکانی یۆنان و ڕۆمان و ئیمپراتۆریەتە کۆنەکان دەنوێنێت.

دۆرکهایم هۆی گۆڕانی کۆمەڵگەی دینامیکی بۆ کۆمەڵگەی ئەندامییەتی بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بەرامبەر بە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان لە چاو رووبەری زەوی و بڕی دەرامەتی داهاتەکانی سرووشتی هەمان زێدیی بەخۆوە نابینێ، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمی شتوومەك خزمەتگوزاری بەرامبەر بە داخوازی زۆر لەسەر شتەکان، ئەمەش وا لە دانیشتوان دەکات کە روو لە سیستەمی تایبەتمەندی و دابەشکردنی کار بکەن، لە ئەنجامدا جۆری بەروبووم و ئاستی گوزەرانی خەڵکی چاك دەبێت، بەڵام هەرکاتێك کۆمەڵگە لە کۆمەڵگەیەکی

**ناتایبەتمەندەوە بگۆڕێت بۆ کۆمەڵگەیەکی تایبەتمند لە کارکرد ئەوا ئەوکاتە وابەستەی کۆمەڵایەتی تێیدا لە وا بەستەی میکانیکیەوە دەگۆڕێت بۆ شێوازی وا بەستەی ئەندامیەتی.**

## ٤- تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی لای ئۆگبێرن:

بیرورای ئۆگبرێن سەبارەت بە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی خۆی لە بیروباوەڕی دواکەتن و سستی شارستانیەتی دەنوێنێ کە لە ساڵی ١٩٢٢دا دەربڕیبوو، **ئۆگبێرن** دەڵێت: ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر شارستانییەتی ماددی دێت خێراترە لەو گۆڕانکارییەکانی کە بەسەر شارستانیەتی نامادی و ئەنجام بۆشاییەکان دەکەوێتە نێوانیان دەبێتە مایەی دواکەوتن یان سستی لە نێوان **کولتووری** مادی و **کولتووری** نموونەیی یان گیانی، ئۆگبرێن شارستانیەتی بۆ دوو بواری سەرەکی دابەش دەکات:

**یەکەمیان:** بواری ماددیە کە پەیوەندی بە دیاردەکان و شتەکانی ماددی و بابەتیی هەستپێکراو هەیە.

**دووەمیان:** بواری ناماددییە کە بیروباوەڕەکانی کۆمەڵ و دابونەریت و پەند و بەهاکانی دەگرێتەوە و تاکەکەسان پێیەوە پابەندن.

هەروەها دەڵێت: هەرچەندە جیاوازی لە نێوان هەردوو بواردا هەیە، کەچی هەریەکەیان دەبێتە تەواوکاری ئەوی دیکە و هاوتای یەکترن و بەهیچ شێوەیەك لە یەکتری جیاناکرێنەوە.

بیروباوەڕێکی دیکەی **ئۆگبێرن** باوەڕی وایە ئامێرەکان بەرهەمهێنان زۆر بەتواناترن کە شێوازێکە دەتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا لە ڕێگەی گۆڕانکاری لە شێوەی ئەو ژینگەی سرووشتەی کە دەوروبەری مرۆڤی داوە دەگۆڕێت.

سەرباری ئەوەش پێشکەوتنی پیشەسازی ئامێرەکانی تەکنەلۆژی، ئەوا گۆڕانی شارستای ئاراستەیەکی درێژ بەدرێژایی مێژوو بە گۆڕانکاری دەبەخشێ هەرچەندە خۆی لەخۆیدا بەدەوامە و ئەنجام زۆر و کەڵەکەبووی لێوەدەست دێت، بەڵام ئەنجامەکەی شارستانیەتی نەوە لەدوای نەوە روو لە زیادی دەکات و هەر نەتەوەیەك بەپێی باری تایبەت پەرە بە رەگەزەکانی شارستانێتی دەدەن و زۆر لە بیروباوەڕ و هونەری نوێ دێتە کایەوە و بۆ نەوەکانی پاش خۆیان جێی دێڵن، ئەمەش هەر لەخۆیدا کلیلی دەرگای گۆڕانکاری کۆمەڵایەتییە بە درێژایی شارستانێتی.

کەواتە پیشەسازی و تەکنەلۆژیا بە گۆڕانکاری سەربەخۆ، دادەنرێ پشت بە سرووشت و کاریگەرێتی وکرداریەتی و هەموو رێکخراوەکان و بنەڕەتەکانی کۆمەڵ دەبەستێت، بەمەش وا دەردەکەوێ کە شارستانێتی ماددی لایەنی پێشەکی بەسەر شارستانێتی ناماددیەوە هەیە و **تێکڕای** جیاوازییەکانی نێوان هەردوو **بوارەکە**

**پێیدەگوترێ**دواکەوتن و سستی، لەبەرئەوەی شارستانێتی شتێکی ئەندامییە و لەچەند بەشێکی تەواو پێکهاتووە، کەواتە دەبێ کێشە بکەوێتە نێوان ئەو بەشەی کە بە خێرا پێشدەکەوێ واتە ئەم بەشەکە **بەشی رابەرە (کولتووری مادی و تەکنەلۆژی)**، لەچاو بەشی یەکەم سستە، بە واتایەکی دیکەش بەشی دووەم لە بەشە خێراییەکەی یەکەم دوادەکەوێ و سست دەبێ ئەم بەشەشیان بەشی **کولتووری** نامادیە، بەلاّم بە درێژایی کات و سات هەندێ جار رەگەزەکانی شارستانێتی نامادی بۆی هەیە خۆی لەگەڵ هەنگاوەکانی شارستانێتی مادی بگونجێنێ و گەر هاتوو ئەمەش رووبدات ئەوا بەسەر زۆربەی زۆری کێشەکانی کۆمەڵ زاڵ دەبێت.

## گۆڕانی بەها کۆمەلاّیەتییەکان:

هەر کۆمەڵگەیەك بەها و دابونەریتی تایبەت بە خۆی هەیە، لەگەڵ ژینگە و باری کۆمەلاّیەتی و ئابوورییەکەی و پلەی پێشکەوتنی شارستانێتی و گەشەکردنە کۆمەلاّیەتییەکەی و گیانی سەردەم و ئەو چەمکانەی ئەندامانی پێوە بەستراونەتەوە.

ئەم بەها و پێوەرانە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە و لە کاتێك بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێت، چونکە هەر کۆمەڵگەیەك کۆمەڵێ تایبەتمەندی و خاسیەتی جیاوازە لەگەڵ چەمك و بەهاکانی کۆمەڵگەیەکی دیکە.. کۆمەڵگەی عێراق لە کۆندا کە پشتیان بە چاندن و کاری دەستکردی دیکە دەبەست، کە کشتوکاڵی دەرەبەگایەتی پێویستی بە دابونەریت و بەهای تایبەتی هەبوو، کە هەندێکیان چاك بوون وەك میوانداری و ئازایەتی و شەرەف و یارمەتیدانی لێقەوماو و هەژاران و هەندێ بەهای دیکەی خراپیشیان هەبووە وەك تیژی و تورەیی رەگەزپەرستی و خێڵەکی.

هەموو بەها چاك و خراپەكانی كۆمەڵگە لەگەڵ سرووشتی ژینگەی كۆمەڵایەتی و كارتێكردنەكانی هێزەكانی ئابووری و رامیاری و ئایینی و رەوشتی و پیشەیی دەگونجێت و سیستەمی كۆمەڵایەتی بە تێكڕای ئەم بەها و نەریتانە پەسند دەكات و بە ڕێبازێكی یارمەتیدانی پاراستنی هێمنی و هاوسەنگی و بارو دەستكەوتەكانی خۆیەتی و بابەتیی دادەنێت.

ئەو بەهایانە پێچەوانەی بەها كۆنەكان بوو كە كۆمەڵگە هەڵی گرتبوو، جیاواز لە نێوان بەها كۆنەكان و بەها نوێیەكان كۆمەڵناسان پێی دەڵێن (ململانێی بەهاكان)، بەڵام ئەو بەها نوێیانەی هاتنە ناو كۆمەڵگەی عێراقی لە چەرخی شۆڕشكردن و گۆڕانكاری كۆمەڵایەتی، بەهای جولاندن و خۆشەویستی كاركردن بەكۆمەڵ و كاركردن لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و دادپەروەری و یەكسانی و دیموكراتی و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و مافەكانی ئافرەت و یەكسان بوونی لەگەڵ پیاو لە ئەرك و مافە كۆمەڵایەتی و رەخنەگرتن لە خود و ڕووبەڕوو بوونەوەی چینایەتی و لایەنگیری و ڕەگەزپەرستی.

سەرەنجامی ململانێی بەهاكان زۆربەی جار سەركەوتن هەر بۆ بەها نوێیەكان بەسەر بەها كۆنەكان دەبێت، بەتایبەتی پاش بڵاوبوونەوەی و پەسەندكردنی لە نێو كۆمەڵگە و لاوازبوونی بەها كۆنەكانەكان و لەناوچوونی ئەم سەركەوتنەش دەبێ سەركردایەتی و لێپرسراوان لایەنگیری بكەن تا بەها تازەكان ڕێڕەوی ئاسایی خۆی بگرێ و جێگای بەها كۆنەكان بگرێتەوە و رەگوڕیشەی لە نێو كۆمەڵدا دابكوتێت و، كاری بێووچان بۆ بڵاوكردنەوەی هۆشیاری رۆشنبیریی لە نێو كەسان و كۆمەڵگە بكەن، بەوەی كە بەها نوێیەكان لە خێزان و كۆمەڵ و شێوازەكانی راگەیاندن و قوتابخانە و كارگە و دامودەزگاكانی كۆمەڵگەی مەدەنی پەیڕەو بكرێت تا لەگەڵ باری نوێی كۆمەڵایەتی رێككەوێت، لەهەمان كاتیشدا بەرەنگاری بەها خراپەكانی كۆن ببنەوە تا ئاكامەكانی كار لە كەس و دەستە و كۆمەڵگە نەكات. لەگەڵ

ئەوانەشدا لەوانەیە لەگەڵ گۆڕانکارییدا هەندێ ڕەفتار و نەریتی خراپ و نامۆ لە کۆمەڵگە سەرهەڵبدا کە کاریگەری لەسەر تاك و کۆمەڵگە دەکات، بۆیە پێویستی بە ماوەیەك هەیە تا تاکەکان خۆیان لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییە نوێیانە ڕادێنن، لەوانەیە گرفتی زۆری لێ بکەوێتە، ئەویش بەهۆی بە هەڵە بەکارهێنانی داهێنراوە نوێیەکان وەکو بەکارهێنانی مۆبایل بەشێوەیەکی نەشیاو.

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

پ١/ گۆڕانی کۆمەڵایەتی چییە؟ ئەو بارو کاریگەرانە چین کاری تێدەکەن؟

پ٢/ باسی گۆڕانی بازنەیی بکە؟

پ٣/ چۆن گۆڕانی ئاسۆیی شی دەکەیتەوە؟ گرنگترین بیروباوەڕەکانی راڤە بکە؟

پ٤/ باسی جیاوازییەکان نێوان گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی بازنەیی و ئاسۆیی بکە؟

پ٥/ ئـەم رسـتـەیە لێـك بـدەوە (بڵاوکردنـەوەی شارسـتانێتی گواسـتنەوەی پێکهاتەکانی شارستانییەتە لـە نیشتمانی سـەرەکییەکەوە بۆ کۆمەڵگـەکان دیکە).

پ٦/ گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی پەرەسەندوو چییە؟ باسی بنـچینە سـەرەکییەکانی زانیارییەکەی بکە؟

پ٧/ بـیر و بۆچـوونی ئۆگـست کۆنـت بکـە لـەبارەی قۆناغـەکانی قەرەسـەندنی کۆمەڵگە؟

پ٨/ شێوەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی بژمێرە و باسی یەکێکیان بکە؟

پ٩/ گرنگترین هۆیەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی دەستنیشان بکە و باسـی رۆڵـی هەریەکەیان لە گۆڕینی بەهاکانی کۆمەڵ بکە.

پ١٠/ گرنگترین ئاکامەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بژمێرە.

پ١١/ فاڕابی چۆن گۆڕانی کۆمەڵایەتی لێکدەداتەوە.

پ١٢/ لەبـەر رۆشـنایی بیردۆزەکـەی فاڕابییـەوە بـەراوردێك لـە نێـوان کۆمەڵگـەی تەواو و کۆمەڵگەی ناتەواو بکە.

پ١٢/ باسی بیردۆزەکەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی ئیبن خەلدوون بکە؟

پ١٤/ بەراوردێکی نێوان کۆمەڵگە و ئـاژەڵ وەك گیانلەبـەرێکی زینـدوو لـە بـارەی گەشە و گۆڕانکاریی بکە.

پ١٥/ بیردۆزەکەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی ئەمیل دۆرکهایم باس بکە؟

پ١٦/ بەراوردێك لە نێوان كۆمەڵگەی (میكانیكی) و كۆمەڵگەی ئەندامیەتی (عضوي) بكە؟

پ١٧/ زانا ئۆكبرێن چۆن گۆڕانكاریی كۆمەڵایەتی لێكدەداتەوە؟

پ١٨/ بەراوردێك لە نێوان بەها كۆنەكان و بەها تازەكان بكە و نموونەیان بۆ بهێنەوە؟

پ١٩/ مەبەست لە (ناتەباییە بەهاكان) چییە رۆڵی لە گۆڕانكاریی كۆمەڵایەتی باس بكە؟

**چالاكی :**

(( گۆڕانی كۆمەڵایەتی چۆن لە كۆمەڵگە روودەدات گفتوگۆی تەواو لە بارەی ئەم دەستەواژە بكرێ))

## فەرهەنگۆك

| كوردی | عەرەبی | كوردی | عەرەبی |
|---|---|---|---|
| ئۆباڵ | جنحة، خطيئة | ئاوێتە | مركب |
| ئاخوند (زەیوان) | كاهن | ئەپستمۆلۆژیا، بیردۆزی زانیاری | نظرية المعرفة |
| ئاراستە | اتجاه | بەرهەمداری | انتاجية |
| ئارامی | سكون، هدوء | بەش | جزء |
| ئارەزووی ئاگاداربوون | حب الاستطلاع | بەش كردن، لێك جیاكردنەوە | تجزئة |
| ئاگاهێنەرەكان (ئاگاداركەرەوە) | المنبهات | بەكاربردن | استهلاك |
| ئاگای خوایی، چاودێری خودایی | العناية الالهية | بەڵگەنەویست | البديهية |
| ئاكاردەرخەر، قیبلەنما | بوصلة | بەڵگەیی، سەلماندن | برهاني |
| ئاماژە | إشارة | بەناچاری– ناچار | مجبر، مضطر |
| ئامار | احصاء | بەرهەمداری | انتاجية |
| ئامارگیری، ئامارگەری | عملية الاحصاء | بەها | قيمة |
| ئامێر | ألة | بەهرە | الهام |
| بەیەكداچوو | متداخل | تەوەر | محور |
| بەیەكچوو (هاوشێوە) | متماثل | تەوزیمی، بەزۆری | اجباري |
| بڕ | مقدار | تەون، رایەل | نسيج |

| براوه(یەکلایی کردنەوە) | محسوم | توێ کردن | تشريح |
| --- | --- | --- | --- |
| برشت، نایاب، پله | امتياز | توێژینەوە | بحث |
| بوار (دەرفەت) | مجال (فرصة) | پۆلین | تصنيف |
| بونیادگەری | البنيوية | پابەند | ملتزم |
| بووژێنەرەوە | منعش | پابەندی | الالتزام |
| بوون | وجود | پاش سروشت(دوای سروشت،میتافیزیك | ما بعد الطبيعة |
| بوونەکی | الوجودية | پایە | مكانة، منزلة |
| بوونەوەر | كائن | پەتی | مجرد |
| بێخەوش (تەواو) | كامل | پەرۆش | حريص |
| تازەکردنەوە، نوێکردنەوە | تحديث | پەستان | ضغط |
| تانووت، تانە | طعن | پەسند | مقبول |
| تەبا ، كۆك | منسجم | پەسندكاریی، جیاكاریی | تفاضلي |
| تەریب | متوازي | پەیوەندی سۆز | تعاطف |
| پەیرەو، رژێم، سیستەم | نظام | خود، خۆ | ذات، نفس |
| پرس | سؤال | خودایی | الهي |
| پرسە | تعزية | خودبەرهەمداری، تێرایی بەرهەمداری | الكفاية الانتاجية |
| پلەدارێتی | المراتبية | خودی، خۆیەکی | ذاتي |
| پوختە | خلاصة | خوو | عادة، صفة |
| پێشبینی، پێشزانی | تنبؤ | دۆزین، دۆزینەوە | اكتشاف |

| پیشەسازی | صناعة | دۆڵی دوو ڕووبار | وادی الرافدین، العراق القدیم |
|---|---|---|---|
| پیشەسازی کردن | تصنیع | دابونەریت | عرف |
| پێکهاتە | ترکیب | دابینکارییەکان | الظوابط |
| پیوەندی | علاقة، رابطة | دادگای پشکنین | محکمة التفتیش |
| جۆر، پەل | فصیلة | داڕزان | تحلل |
| جیهانی کەرستەیی | العالم المادي | داڕشتن | صیاغة |
| خۆجیاکەرەوەکان | المعتزلة | داستان | ملحمة |
| خۆرە، میکرۆب | جرثوم | دامرکاندنەوە، دابینکردن | اخماد، اشباع |
| خۆرسك | فطري، طبيعي | داهات | دخل |
| خانەی دانایی | دار الحکمة | داهێزران (لێکهەڵوەشانەوە) | تفکك |
| داهێنان | اختراع | ژیرکاری | الممارسة العقلية |
| دەرئەنجام | استنتاج | ژیری | عقل |
| دەرەکی | خارجي | راز | سر |
| دەرهاویشتن | استثناء | راستەقینە | واقعي |
| دەرهێنانەکی | استنباطي | رامان | تأمل |
| دەزگا، دامەزراو | مؤسسة، منشأة | رەگەز ئامێز | عرقي |
| دەستەواژە | عبارة، فقرة | رەفتارەکی | سلوکي |
| دەمارگیری، توندڕەوی | تعصب | رەها | مطلق |
| دەنکۆڵە | حبية | رەوەن | سیاق |
| دژواری | تناقض | رەوشت، ئاکار | الاخلاق |
| دووانەکی، دوولایەنی | ثنائي، ازدواجي | رەوشتناسی | علم الاخلاق |
| دیار | ظاهر | رژانەوە | فیض |

| دیارده | ظاهرة | رشته | صيغة |
|---|---|---|---|
| دیالێکتك، بێژیاری | جدل | روانگه | مرصد |
| دیان، فەلە | كريستيان، مسيحي | رووپایی | مجاملة |
| دیدەنی، تێڕوانین | مقابلة، رؤية | رووپێوناسی | علم المساحة |
| ژیاری، شارستانی | الحضارة | سۆزدار | عاطفي |
| ژیربێژی، لۆژیك | المنطق | سات، كات | وقت |
| ژینگە، دەوروبەر | البيئة | ساپیتە، بنمیچ | سقف |
| ستایش | مدح، وصف | شت، شمەك | الاشياء |
| سەپاندن | فرض | شوێنەوار | اثار، اثر |
| سەرتاسەری، سەراپاگیری | شمولی | شیاو | ممكن، محتمل |
| سەرپێچیكار | مخالف | شیكردنەوە | تحليل |
| سەلماندن | برهان، قبول | شێوەگۆڕین | تناسخ |
| سەنگین، گران، شكۆدار | ثقيل، جليل | شێوەكردن، بۆچوون | تصور |
| ستوون، پایە | عمود | شێوەكی | شكلي |
| سروەت، سەقامگیری | امان، استقرار | چۆنەكی | كيفي |
| سروش | وحي | چاولێكەر | محاكي |
| سڵ | حذر | چەسپاو | ثابت |
| سواڵەت | أواني فنحارية | چەق، مەڵبەند، ناوەند | مركز |
| سووسەكردن، پێزانین | ادراك | چەمك | مفهوم |
| شارە چاكەكە | المدينة الفاضلة | چێژ | ذوق |
| شارەزا، پسپۆر | خبير، مختص | چییەتی | ماهية |

| شارەزای کرداری، پسپۆرسازی | خبرة عملية | فەلسەفەکاری | تفلسف |
| --- | --- | --- | --- |
| شاکار | تحفة، روائع | فریشتە | ملاك |
| | | | |
| قۆناغ | مرحلة | لەڕێ لادان، لەڕێدەرچوون | انحراف |
| قەشەنگ | رائع | مۆرك، شەقڵ | صفة |
| قسەناسی | علم الكلام | نائاسایی، ئاسایی بەدەر | خارق العادة |
| قووڕی دروستکراو | الطين الصناعي | ناسنامە، پێناس | هوية |
| قووچەك | هرم | نزیك کەوتن، توخن کەوتن | تعرض |
| کۆچەری | بداوة | هۆپێناو (شێواز)، ئامراز | وسيلة |
| کاراکتەر | الشخصية المسرحية | هەڵوەشانەوە | تفكك |
| کارامە (لێهاتوو) | مقتدر | هەیوانییەکان، دالآنییەکان | الرواقيون |
| کانزاکاری | تعدين | ڕێباوەری خوداداری | مذهب المؤلهة |
| کەرستەیی، ماددی | مادي | | |
| کەلێن | فجوة | | |
| کەنەفتەیی | عجز | | |
| کپکردن | كبت | | |
| کرداری | عملي | | |
| لاشەخۆشکردن، مۆمیاکردن | تحنيط | | |